

# دوایین هەناسە لە سوجدەدا

خالید ئێرتوغروڵ


**ناوی ڕۆمان: دوایین هەناسە لە سوجدەدا**

**نووسینی: خالید ئێرتوغروڵ**

**وەرگێڕانی: ئارا محمد**

**تیراژ: (۲۰۰۰) دانە**

**نۆبەی چاپ: یەکەم**

**لەبەڕێوەبەرایەتی گشتی کتێبخانە گشتییەکان**

**ژمارە(۱۷۸٦)ی ساڵی ۲۰۱۲ی پێ دراوە**






بنکەی سەرەکی بڵاوکردنەوەی بەرهەمەکانی ناوەندی ڕاگەیاندنی ئارا – سلێمانی / شەقامی پیرەمێرد

0770 358 7100 - 0750 106 9589 - 0748 013 4669 ara.m@hotmail.com

# دوایین هەناسە
# لە سوجدەدا



نووسینی

**خالید ئێرتوغروڵ**

وەرگێڕانی

**تارا محمد**

نۆبەی چاپ

یەکەم - ٢٠١٢

# پێشەکی

ڕۆژانە لە خوێنەرەکانمەوە دەیان نامەو پەیامم پێ دەگات... بەڵێ، بابەتەکانی ناو ئەم کتێبە کە هەڵگوزراوی بەسەرهاتەکانی ژیانی کەسێکە، وەك ئەوانی تر وایە. ئەم چیرۆکی ژیانە بەجۆرێك پڕ لەوانەی بەپەند بوو هەر لەیەکەمین خوێندنەوەیدا بەتەواوی مانا کاری تێ کردم! لەدڵی خۆمدا وتم: بەدڵنیاییەوە دەبێت بکرێت بە کتێب. یەکسەر پەیوەندیم بەو خوێنەرەمەوە کرد کە نامەکەی بۆ ناردبووم و، بەتەواوی گوێم بۆ بەسەرهاتەکەی گرت، سەرسوڕمان و پەرۆشیم زیادی کرد..." خودایە چۆن شتی وا دەبێت!"....، ئیتر ئەو ڕووداوە سەرسوڕهێنەرەی کە مرۆڤ سەرسام دەکات بەشێوەی کتێب هاتە بەرهەم.

" دواین هەناسە لە سوجدەدا"...

ئەم بەرهەمەی کە لەو بەسەرهاتە ڕاستەقینانە دروست بووە سەرتاپا یادەوەری و سەرگوزشتەی پڕپەندە، بەمەبەستی هۆنینەوەی ئەدەبیات یاخود بانگەشەی شابەرهەمیی نەنووسراوە، لەبەر ئەوە ناکرێت ئەم کتێبە" دوا هەناسە لە سوجدەدا" بەپێوەرە بەرزە ئەدەبیەکانی چیرۆك و ڕۆمان هەڵبسەنگێنرێت.

ئەو کۆمەڵەی ئامانجمە ئەم کتێبەیان پێ بگات، بەتایبەت چینی گەنجانن، لەبەر ئەوە تێگەیشتنی ئاسانەو بە شێوازێکی سادە داڕێژراوە و ڕستەی کورتی تیادا بەکارهاتووە، هەر لێرەوە دەمەوێت ئەوەش ڕوون بکەمەوە، کە بۆچی باس و بابەتی هاوشێوە لەناو کتێبەکانماندا کاریان لەسەر دەکرێت؟! ئەمە دوو هۆکاری بنچینەیی هەیە:

یەکەم: ڕووداوە باسکراوەکان ڕۆمانێك، چیرۆکێك، یاخود کارێکی مۆنتاژ کراو نین، بەتەواوی چیرۆکێکی وەرگیراوە لە ژیان و بەسەرهاتی ڕاستەقینەی کەسێك، لەبەر ئەوە دەبێت وەك خۆی بگێڕدرێتەوەو هەرگیز لەبەر فەنتازیاو جوانی، ڕووداوەکان ناگۆڕێن.

دووەمیش: ئەو بابەتانەی دەوروژێنرێن، بۆ پتەو کردنەوەی بەها ڕەوشتییەکانی کۆمەڵ و بەتایبەت چینی لاوانە، ئەمانە ئەو بابەتانەن کە وا دەکەن خوێنەرەکان بەژیانی خۆیاندا بچنەوەو ڕووداوەکان هەڵسەنگێنن و لە وردو درشتی هەڵەکانی خۆیان بپرسنەوە.

گومانمان نییە لەوەی هەر لەگەنجانەوە تا پیرەکان، لە هاوسەردارەکانەوە تاکو زگوردی و تاکەکان، لە سەرۆکەکانەوە تا کرێکارەکان بەگرنگیەوە ئەم کتێبە دەخوێننەوە، بۆ هەمووشیان ئەوەندەی پێویست وانەو پەندی مەعنەوی هەیە...ئەوانەی بەرگەی فرمێسکەکان دەگرن... ! فەرموون.....

خالید ئێرتوغرول

# بەشی یەکەم

## هەموو شتێك لەئاگرێکەوە دەستی پێکرد



### بازاڕی گیان..

لە هۆڵەکانی بەشی ناوخۆیی کچاندا.. لەپڕێکدا دەنگ و هاوار بەرز بووەوە، ئەوەی گوێی لەو دەنگە بوایە ڕۆحی دەهاتە لووتی.

– ئاگر کەوتووەتەوە، ئاگر!

– هەستن، هاوڕێکانتان بەئاگا بهێننەوە!

– خێراکەن، گیانی خۆتان ڕزگار بکەن!

– دەسوتێن ! دەسوتێن!

لەناو ئەم کابوسی هاوارو پەشۆکانەدا بەترسەوە لەجێگاکانمان ڕاپەڕین!

لەناو دووکەڵی خنکێنەرو بێ ئاماندا کە قوڕگ و سیەکانمانی ئاخنی بوو واقمان وڕمابوو، نەماندەزانی تووشی چی بووین.. ئەو

کچە خوێندکارانەی کە هاوارو ناڵەیان گوێیەکانی کاس دەکرد، دەتوت لە بازاڕی گیاندان و تۆزێکی تر گیانی ئەوانیش هەڕاج دەکرێت.

لەوەش ترسناک تر، کارەبا بڕابوو، دونیا تاریک و نوتەک چناو چاوی نەدەبینی.

هەمووان لەناو ئەو تاریکاییە ئەنگوستە چاوەدا کە زیاتر لە چاڵێکی جەهەننەم دەچوو لەترس و پەشۆکانی خۆمان باوەشمان بەیەکتردا دەکرد، لە هەموو گەردەکانی لەشماندا هەستمان بەبەرکەوتنە ترسناکەکانی مەرگ دەکرد.

وەک ئەوەی (ئیزرائیل) بە تەوقێکی پۆڵایی توند قوڕگمانی گرتبێت و مێشکمان بە ترسی مەرگ بناخنێت!

هەموو خوێندکارەکان کە بەژاوەژاوە بەرزەکە بەئاگا هاتبوون، لەناو دووکەڵە خنکێنەرەکەدا تا لێواری مەرگ دەکۆکین، دوای هەڵگرتنی چەند هەنگاوێك بەرگەیان نەدەگرت و دەکەوتن بەزەویدا، تەنانەت لەمانەش سەیرترو لەپێناو بەرەنگار بوونەوەداو، بۆ دۆزینەوەی ڕێگای دەرباز بوون، پاڵیان بەدەرگاکانەوە دەناو هێرشیان بەرەو پەنجەرەکان دەبرد، تەنانەت لە نهۆمی چوارەمەوە پەنجەرەیان دەشکاندو خۆیان دەخستە خوارەوە، ئەم کردەوە پڕ لە ناچاریی و بێ بیرکردنەوەیەش هەموو ئومێدەکانی ژیانیانی سفر دەکردەوە.

- دایە گیان، خەریکە دەخنکێم!..

- بابە گیان، وادەمرم..!..

- کەس نیە یارمەتیمان بدات؟!..

- بەفریامان بگەن..!

ناڵەو هاواری بەسوێی ئەو کچە نازدارانەی دایکیان کە بەخەیاڵە ئەرخەوانیەکانیان ژیانیان لە ئامێز گرتبوو، دڵی دادەچڵەکاند جگەری پارچە پارچە دەکرد، بەڵام دیوارە کەڕەکانی بەبەزەیی نەدەهێنا! لەو شەوە سامناکەدا کە ئەو ڕۆحە گەنجانەی تیا لەناو دەچوو، کەس قسەی کەسی نەدەبیست، کەس یارمەتی کەسی نەدەدا . لەو کارەساتە پەرێشانکەرەدا کە لەو بەشە ناوخۆییەی کچاندا دەگوزەرا، گەنجەکان بەسەریەکدا دەڕۆیشتن و شەڕی ئەوەیان دەکرد خۆیان پێش ئەوانی تر فڕێ بدەنە دەرەوە، بۆ ڕزگاربوون لەو فڕنە کڵپەسەندووە، بە کێشەکێش خۆم بەسەر ئەو خوێندکارە بێهۆشانەی سەر زەوییەکەدا ڕادەکێشاو بۆ شوێنی دەرباز بوون دەگەڕام. ئەوە یەکەمین جار بوو لە ژیانمدا بەو شێوەیەو بەو پەشۆکانەوە هەوڵ بدەم لە مردن ڕابکەم، نازانم چۆن بوو، بەڵام پاش کەمێك خۆمم لەدەرەوە بینیەوە، ئیتر بەهۆی بەرگەنەگرتنم بەو دووکەڵەی لەناو سیەکانمدا دەسوڕایەوەو وەکو چەقۆ هەناسەکانمی دەبڕی، کەوتمە سەر ئەو شەقامەی شەختە سەهۆڵ دایپۆشیبوو، هەوای دەرەوە هێندە ساردبوو مرۆڤ دەیبەست، منیش هەر لە ململانێی ژیاندابووم.

" ئـاه بـۆ هەناسـەیەك .. خـەریکم دەخنکـێم.. خـودای مـن هەناسـەیەك.."، لەوکاتـەدا تێگەیشـتم کـە بەشـی هەناسـەیەك هـەوا چـەندە گرنگـە بـۆ مرۆڤ...مەگـەر لەوکاتـەدا بـۆ یـەك هەناسـە چیم نەدەبەخشـی...! مـن و دەیـان هـاوڕێم لەسـەر نیـو مـەتر بـەفر کەوتبووین و بۆ هەناسەیەك گیانمان دەدا. ئەوێ لە شۆستەی شـەقام نەدەچوو، بەڵکو لەناو سەرمای بێ ئامانی ئەو شەوەدا دەتوت بازاڕی هەراج کردنی گیانی ئەو مرۆڤە گەنجانەیە.

خودایـە... ئـەوە چ نەگبەتیـەك بـوو! ئەوانـەی لـە نهۆمـەکانی سەرەوە خۆیان فڕێ دابوو، ئەوانەی لە نهۆمی خـوارەوە دەشـێلران، ئەوانەی ترنجابوونە سوچ و گۆشە تاریکەکانەوە، ئەوانەی دەسـتیان، قاچیان، سەریان شکابوو، لەشیان سـوتا بـوو... ئەوانـەی بـە دوایـین هەناسەی سوتاویانەوە هاواری ماڵئاواییان لەدایك و باوکیان دەکرد...

ئەو تابلۆ بەسوێیە هەناوی ئاگر تێ بەردەدا، وەکو خەنجەر لەدڵی دەدا، کۆتـایی بـە هـەموو ئومێـدەکان دەهێنـا و خەیاڵـەکانی دەبڕاندەوە... ویژدان و دڵەکان بەرگەیان نەدەگرت..!

ئـەوە فیلمێکـی ڕاسـتەقینەی ئەوەنـدە پـڕ ئـازار بـوو کـە بـاس نەدەکرا.. مەگەر کەسێك بەسەری هاتبێت تێ بگات...

ماوەیـەکی زۆر تێنەپـەڕی ئـەو شـوێنە وەك سـەرای مەحشـەری لێهـات. ئـاگر کوژێنـەرەوەکان، ئـەمبولانس و دەسـتەی فریاکـەوتن،

هاوڵاتیانی ئەو دەوروبەرەو ئەو کەسانەی کە بەهەڵەداوان بۆ یارمەتی هاتبوون...

شڵەژاویەکی زۆر بەدی دەکرا. هەرکەسەو شتێکی دەوت بەڵام دیار نەبوو کێ چی دەڵێت..! کە ئەو تۆپەڵە ئاگرو گڕەی لە سەقف و پەنجەرەکانەوە دەکەوتە خوارەوە دەستی کرد بە ڕۆشن کردنەوەی چواردەور، ئەو دیمەنە تۆقینەرە هێندەی تر بە ئاشکرا دەرکەوت.

لەناو ئەو بارودۆخە سامناکەدا، نازانم چەند جار دایك و باوکم لە پێش چاومدا هاتن و چوون، چەند جار خەیاڵەکانی گەنجیم لەگەڵ زەویدا یەکسان بوون، چەند جار حەسرەت و خۆزگەکانم سوتان و بوونە خۆڵەمێش.

ئەو تابلۆیماڵئاواییە سات لەدوای سات ژیانمی دەسوتاندو، وەکو پشکۆ دەچزا بە ڕۆحمداو لەناوی دەبردم.

دوور لە خێزانەکەم کە وەك چاویان پارێزگاریان لەمن دەکرد، لەناو دەستی گەورەی بێ چارەییدا بە شوێن تیشکی ئومێدێکدا دەگەڕام، بەجل و بەرگی ماڵەوە خۆم هەڵدا بووە دەرەوە و بە پێخاوسی لەناو نیو مەتر بەفردا بەشوێن تروسکاییەکدا وێڵ بووم، پێم پەتی بوو، بەڵام سەیر بوو چونکە هەستم بەسەرما نەدەکرد، بەتەواوی تووشی شۆك بوو بووم! هەوڵم دەدا دووربکەومەوە لەو بەشی ناوخۆیی کچانەی لە گەڕەکێکی قەراغ شاردا دروست کرابوو، لەپێناو ئەوەی بگەمە جێگەیەکی باوەڕ پێکراو، ڕاست بەرەو ناو ئەو

خەڵکە غەریبانەو ئەو ماڵانەی کە لە گڵ دروست کرابوون دەستم بەڕاکردن کرد، ناتوانم وەسفی بکەم چەندە لەترس و شپرزەییدا بووم! بەجۆرێك وام دەزانی ئەگەر ئاوڕێك بەرەو دواوە بدەمەوە، ئەو کڵپە تۆقێنەرانەی لەبەر چاومدا وەك ئەژدیهایان لێ هاتبوو منیش وەکو هاوڕێکانم قووت دەدەن.

کاتێك کەوتمە ناو ئەو ڕیزە خانۆچکە گڵە یەك نهۆمیە بچووکانەوە بۆ ئەوەی ئامانجێك بۆ خۆم دیاری بکەم پاڵم بە ستونێکی کارەباوە دایەوەو دەستم کرد بە بیرکردنەوە. بۆئەوەی بتوانم هەناسە بدەم خێرا خێرا هەوام هەڵدەمژی، ئەو کاتە هەستم کرد کە چەندە لەحاڵێکی پەرێشاندام.

ئای خوایە گیان...

ڕێك لە کەسێکی داماوی شێواو دەچووم کە لە جەنگ گەڕابێتەوە، قۆڵی ڕاستم لە ئازاردا هاواری دەکرد، کە کەوتبووم بەزەویدا زۆر بریندار بوو بوو، قاچەکانم بریندار بوو بوون و خوێنیان پێدا دەهاتە خوارەوە. کاتێك لەناو قەرەباڵغیەکەدا کەوتبوومە سەر زەوی، چەناگەم زامدار بوو بوو، تا دەمسڕی زیاتر خوێنی لێ دەهات، سوتاویەکانی پشتیشم ئازارەکەی هەر باس نەدەکرا، کە دەهاتمەوە هۆش خۆم زیاتر هەستم بەئازار دەکرد.

جلەکانی بەرم شڕوشیتاڵ بووبوون، توانام نەبوو یەك هەنگاوی تر بێنم، چۆن خۆمم بشاردایەتەوە لەوانەی کە لەو حاڵەمدا دەیانبینم!؟

ئازاری سەختی برینەکانم و سەرما تەزێنەرەکەی ئەو شەوە وەك چەقۆ کاری لەگیانم دەکرد بەجۆرێك بەرگەی نەدەگیرا، دەمزانی ئەگەر جێیەکی گەرم نەدۆزمەوە، نیو کاتژمێری تر بەرگە ناگرم و هەموو لاشەم دەیبەستێ، لەناو جەرگەی ئاگرەوە ڕزگارم بوو بوو بەڵام وەکو بەرخێك کە لەناو قورگی شێردا بێت، لە سەرمای بێ بەزەیی زستاندا چاوەڕوانی مەرگ بووم.

## سوپرایزی ژیانم:

دانیشتوانی ئەو گەڕەکەی کەناری شار هەندێکیان لە پێشی دەرگاکەیان وەستا بوون تەماشای ئەو دیمەنە دڵتەزێنەیان دەکرد، هەندێکیشیان بە خاکەنازو سەتڵ و هەر شتێکەوە کە دەکەوتە بەردەستیان بۆ یارمەتی ڕایان دەکرد، هەستێکی سەیر لەناو ناخمدا دروست بوو بوو کە ئازارەکانمی بیردەبردمەوە، لەبەرامبەر ئەو خەڵکەی ئەنادۆڵدا کە پێشبڕکێی هاوکاری کردنیان دەکرد، هەوڵ و تەقەلای ئەو کەسە غەریبانە بۆ چارە دۆزینەوە بۆ ئەو بێ چارانە، بەدرێژایی ژیانم وێنایەکی نەسڕاوەی لەمێشکمدا جێ هێشت بوو.

کاتێك هەستم کرد سڕ بوونی پەنجەکانم زیاد دەکات و بەرەو قاچم و هەموو گیانم پەل دەکێشێت، زۆر ترسام بەخێرایی بەئومێدێکی زۆرەوە بەرەو ماڵێکی بچووکی یەك نهۆمی نزیك خۆم ڕۆیشتم، خانمێکی پیر کە هەر لەپەنجەرەی ئەوماڵەوە حاڵی پەرێشانی منی

بینی بوو دەرگاکەی کردەوە و بەپەلە هاتە دەرەوە وەکو چۆلەکە باڵەکانی بۆکردمەوە لەئامێزی گرتم:

- ڕۆڵەکەم... بەرخەکەم..سەیری حاڵی بکە، خۆ بویتە سەهۆڵ، خێراکە وەرە ژوورەوە، بەقوربانت بم باڵا بەرزەکەم، ئێرە جێگەیەکی باوەڕ پێکراوە، دەتوانی وەکو ماڵی خۆت ئاسوودەبیت فریشتەکەم...

ئەو خانمەی کە لە هەستەکانیدا هێندەی سەدان دایك خۆشەویستی و میهری لێ دەباری، بەئامێز گرتنەوە منی بردە ماڵەکەی، لەناو زۆپایەکی تەنەکەدا کۆمەڵێك وردە دار دەسوتا، دۆشەك و سەرینی کۆن کە بەڕیز دانرا بوون، بەچوونە ژوورەوەم بۆ ناو ئەو خانووە گڵە یەك نهۆمە بچووکە، ڕووبەڕووی دیمەنێکی باوەڕ پێنەکراو بوومەوە، ڕێکو پێکی و خاوێنی ناو ژوورەکە بەجۆرێك سەرنج ڕاکێش بوو، کە دەتوت جوانی ناو ناخی ئەو خانمە پیرە لەناو ماڵەکەشدا ڕەنگی داوەتەوە.

منی لەسەر قەنەفەیەکی بچوك و بەڵام سەرنج ڕاکێش پاڵ خست، لەدایکێك دەچوو کە نەوەیەکی خۆی لەکارەساتێك گەڕابێتەوە، باش دیاربوو لە ناخەوە خەمی بۆ دەخواردم، هەروەك ئەو وشە پڕ خۆشەویستی و سۆزانەی لەزمانیشی دەباری، وەکو چارەسەری دەروونی کاری لەدەروونم دەکردو مەست دەبووم پێی.

لەناو ئەو ئازارە زۆر و سەرما بەرگە نەگیراوەدا، ئەگەر ئەو خانمە میهرەبانەم نەبینیایە، حاڵم چی بەسەر دەهات، نەمدەتوانی بیریشی لێ بکەمەوە، لەتەنیشت ئەو زۆپایەدا کە کەش و هەوا ساردەکەی گۆڕی بوو بەگەرمای مانگی ئاب، ئەو پزیشکە میهرەبانەش دەستی کرد بە گۆڕینی جلە دڕاو و تەڕەکانم، لەلایەك دەست و قاچی دەشۆردم بۆ ئەوەی ئەو لەرزینەم بوەستێنێت کە نەمدەتوانی بەسەریدا زاڵ بم، لەلایەکی تریش وەکو پەرستار برینەکانمی پاك دەکردەوە.

زۆر سەرسام بووم کە لەو ماڵە هەژارەدا تیمارکەرێکی بەئەزموونی وەك ئەم خانمەو هەموو پێویستییەکی برینپێچی هەبوو! سەرسام بووم بەلێزانی و ئەزموون و میهرەبانییەکەی.. ئەی دڵی بۆ ناڵێی؟! سۆزی ئەو چارەسەری ڕاستەقینەی من بوو، چونکە هەموو تەمەنم لەشوێنێك بەسەر بردبوو کە نەمدەزانی پێویستیی چییە، هەموو شتێکم بە پارە دەکڕی، ئاواتی هەر شتێکم بخواستایە بەدەستم دەهێنا، بەڵام تا ئەوکاتە نەمزانیبوو چەندە موحتاجی خۆشەویستیم، لەنێو ئەو خزمەتکارانەی لەمنداڵیمدا بەدەممەوە بوون نە ئەو میهرەبانیەم بینیبوو و، نەهەستم بەو گرنگی پێدانە کردبوو.

خانمی پیر کە دەستی بە برینەکانمەوە بوو لەلایەك دەیوت:" قوربانت بم کچم، زۆر ئازارت هەیە؟!" دەستی بەسەرمدا دەهێنا، لەلایەکی تریش بۆ گەرم کردنەوەی دڵە سڕبووەکەم میهرەبانی و

قسەی خۆشی بە گوێدا دەچرپاندم. ئەو نزیکییە بێ هاوتایەو ئەو فیداکاری و هاوکارییەی لە ژیانە پڕ بریق و باقە دەوڵەمەندانەکەمدا کە خزمەتکارەکان بەیەکدا دەهاتن و هەمووانی ئەبڵەق دەکردو زۆرکەس ئێرەیی پێ دەبرد نەمبینیبوو، لەناو ئەمماڵە گڵە بۆن خەڵوزە بچکۆلەیەی ئەنادۆڵدا کە کەلوپەلەکانی ئاوی بە پەنجەی دەست دەژمێردران دۆزیمەوە.

لەپشت سەرمەوە ئەو خانمە پیرە وەستا بوو، هەر لەدایکێك دەچوو کە چەندین ساڵە چاوەڕێی ڕۆڵەکەیەتی، وەك ئەوەی من تاکە سەروەتی ئەو بم لەدنیادا، چاوەکانی لەسەر لانەدەبردم و وەکو ڕۆڵەی خۆی بۆنی پێوە دەکردم.

- ڕۆڵەکەم، شتێکی وات نیە، من بە دەستەکانی خۆم تیمارت دەکەم، ئێرە باشترە لە نەخۆشخانە، هیچ کەس وەکو من ئاگادارت نابێت!

ئەو دەریای سۆزەی کە لە چاوەکانیدا دەمبینی تەواو سەرسامی کردبووم، نەمدەتوانی دڵنیابم کە ئەم خانمە بەڕاستی مرۆڤە، یان فریشتەیە.

وادیار بوو لە نیگاکانمەوە خەیاڵمی خوێندەوە" ئێوە کێن؟" کە وەڵامی دایەوە : ڕاستە لەپەرۆشیما نەپرسیاری ناوی تۆم کرد، نەخۆیشم ناساند. بە هەستێکی گەرم و میهرەبانییەکی زۆرەوە قسەی بۆ دەکردم.

- ڕۆڵەکـەم، مـن پەرسـتارێکی خانەنشـینم، نـاوم فاطمـەیـە. چـەند ساڵێك بەر لەئێستا هاوسەرەکەم لەدەست دا، لەدوای ئەوەش خەڵکی بێ ئینساف هاتنە سەرسەرم و بەناوی ئەوەی" هاوسەرەکەت قـەرزی ئێمەی لایە".... هەرچیمان هـەبوو بردیـان، لەگـەڵ منالّـە تاقانەکـەم ڕووبـەڕووی ئـەو ژیانـە سـەختە بوینـەوە، لەکۆتاییـدا ئـەم خـانووە بچـوکەم دەسـت کـەوت ئێسـتاش لەگـەڵ کوڕەکـەم دەژیـن و سوپاسگوزاری خواین.

دیسـان لـەناو چـاوانی منـدا خـۆی ون کـرد، چـی لـە چـاوەکانمدا دەبینـی نـازانم، کـە سـەری ڕاوەشـاند بەخەمبارییـەوە پـاش کـەمێك برژانگەکانی بە نەرمی جولاندو بە هەستێکی شیرینەوە:

- ئێرە جێگەیەکی زۆر پڕ متمانەیە، لەگەڵ گەڕەکەکەشدا وەکو یـەك خێـزانین، لێـرە هـیچ کـەس زیـانی پـێ ناگەیـەنرێت، هـەموان چـاکە خوازن و حەزیان بەیارمەتییە، پشوو بدەو ئاسوودە بـە ڕۆڵەکـەم، تـا چاك دەبیتەوە میوانی ئێمەیت.

## ئەمە دەبێت فریشتە بێت:

ئیتر دەمزانی ئەو خانمە فریشتەیەی ئەو هەموو ترس و دڵـەڕاوکێ و ئـازار و ناڕەحەتیـەی لەبیربردمـەوە کێیـە، ئـەو جـۆرە کەسـانەی لەناخـەوە بـۆ ئـەوانی تـر دەسـوتێن وەك حـەزرەتی خضـرن، وەك

ئەولیان چ بەختەوەری و ڕێزێکی زۆر بوو بۆ من کە ببمە میوانی کەسێکی لەو جۆرە.

لەناو دەریای میهری ئەو خانمەدا خۆم ون کردبوو لەناخی خۆمدا دەموت: خودایە! مرۆڤێك دەتوانێت بەم جۆرە کاریگەریی لەسەر دەروونی ئەوانی تر هەبێت! دەکرێت بەم سادەییە مرۆڤ بتوانێت لەناخەوە هەستی خۆشەویستی و هاوسۆزی و دۆستایەتی دەرببڕێت!

مرۆڤ بە سەیرکردنیشی ئاسوودە دەبوو، وەك چارەسەرێکی ئەفسوناوی هەموو دەردو خەم و نەخۆشیەکانی ڕەواندەوە.

– ڕۆڵەکەم ئەی تۆ کێیت؟

ئەوەندە لەدڵەوە ئەو پرسیارەی کرد سەرسام بووم وەك ئەوەی چەندین ساڵ لەچاوەڕوانی کەسێکدا بووبێت کە لە دەرگاکەی بدات. ئەو ڕوخسارە پڕ میهرەشی وەك ئەوە بوو لەپەرۆشی چاوەڕوانیەکەیدا ئەو کەسە من بم! چەند شەرم بوو، بەرامبەر ئەو مرۆڤە باش و ناوازەیە، وەڵامم پێ نەدرایەوە ئەو شوێنەی لێوەی هاتووم و ئەو ژیانەی تیایدا ژیاوم شایەنی ئێرە نییە بەخەمبارییەوە ڕووم وەرگێڕاو تەنها توانیم بڵێم:

– ناوم (ئیلکای)یە..

دوای ئەوە قسەم پێ نەکرا، بێ گومان ئەو خانمە تێگەیشتوەش وای بیرکردۆتەوە ئەوە هۆکارێکی هەیە بۆیە لەسەری نەڕۆیشت.

بیرم له هەموو ئەو ڕووداوانە کردەوە کە بەسەرمدا هاتن، خەیاڵم ڕۆیشت، باوەڕم بەو شتانە نەدەکرد کە هاتنە ڕێم، من کچی بازرگانێکی بەناوبانگ بووم، کە لە ژیانمدا نەبوونی و بێ چارەیی و قەدەری ناخۆشم نەدیبوو، ژیانم لە دەوڵەمەندیدا بەسەر بردبوو ئەوەی بمویستایە هەبوو، ئەوەی داوام بکردایە بۆم دەکرا، بەنازداری گەورەکرا بووم، لەخوێندنگەی تایبەت خوێندبووم لای مامۆستای تایبەت وانەم وەرگرتبوو، هەر بەمنداڵی سکرتێرو شۆفێری خۆمم هەبوو کە خۆم پێم دەوتن چی بکەن و چی نەکەن. شار نەمابوو گەشتم بۆ نەکردبێ و وڵات نەمابوو سەردانم نەکردبێت و هیچ شوێنێکی گەشتیاری نەمابوو سەرم پیانەکردبێت. لەماڵی باوکی دەوڵەمەندمدا بە ڕۆحێکی سەردەمی و سەربەستەوە هەڵسوکەوتم دەکردو، کەسێکی بێ بەندوبارو گوێنەدەر بە عەیبەو سەرکەشم لێ دەرچووبوو. کەسێکی لووتبەرزو لەخۆباییم لێ دەرچوو بوو کە نەمدەزانی لەخوارەوە چی دەگوزەرێ، تەنها لەخەمی خۆشیەکانی خۆمدا بووم.

باوکم لەوەتەی هەبوو دین و کەسانی دینداری هیچ خۆش نەدەویست، ئەو بارە ڕۆحیە خراپەی ئەویش کاریگەری لەسەر هەموو خێزانەکەمان بەجێ هێشت بوو، لەوانەیە ئەویش لەژێر کاریگەری ئەو دەورو بەرەیدا بووبێت کە مولحیدی بە ڕەچەڵەک جولەکەبوون، بەڵام لایەنی کەم ئەگەر ئەوان لەڕۆژانی بۆنە و

جەژنەکاندا لەکلتوری خۆیان لایان نەدەدا و ڕێزی یادەکانیان دەگرت ئێمە بەرامبەر جەژن و یادەکانی خۆشمان هیچ ڕێزێکمان پیشان نەدەدا.

لەناو ئەو پارەیەی کە وەکو لافاو لەبەردەستمدا دەڕۆیشت و لەو دونیایەی کە چاوی ئەبڵەق دەکرد، بەردەوام لە حەسرەتی نەبوونی دوو شتدا بووم: خۆشەویستی و وەفا.... لەناخی ئەو مرۆڤانەدا کە بووبوونە بەندەو کۆیلەی پارە هیچ نیشانەیەك لە ئاسوودەیی و خۆشەویستی پاك و وەفا نەدەبینرا، لەبەر ئەوە زۆر زوو لەو دونیا ساردو سڕە پڕ لە بەرژەوەندییە بێزار بوو بووم.

باوکم لەدوای ئامادەیی، بۆ خوێندن منی دەنارده فەرەنسا بۆ خوێندنی ئەکادیمی و بوون بەکەسێکی زانست دۆست. بەڵام من ئەمەم ڕەت کردەوە چونکە لەکەسانی گیرفان پڕو ڕۆح بەتاڵ و دوور لەهەست بێزار بوو بووم ، لەبەر ئەوە لەسەر داوای هاوڕێیەکم بڕیارم دا بۆ ناسینی کەسانی هەژارو غەریب بچینە شارێکی بچوکی ئەنادۆڵ چونکە ئەو هاوڕێیەم پێی دەوتم لەوێ دۆستایەتی ڕاستەقینەو ژیانێکی دروست و خۆشەویستیەك لەناخەوە هەست پێ دەکەیت، منیش هەر لە حەسرەتی ئەمانەدا بووم.

## خۆشەویستی ئەم خاکە:

ئەم خۆشەویستیە منی هێنایە ئێرە، کە بەم جۆرە منی لەو نازو نیعمەتانەوە، لەخوێندنی تایبەت و ژیانی تایبەت و ئۆتۆمبێلی تازە مۆدیلەوە، فڕێ دایە ناو ئەم ڕووداوانەوە سەرەڕای ئەوەی کە باوکم پێی وتم:" ئەگەر گوێ لەمن نەگریت، لەمناڵی خۆم بێ بەریت دەکەم"..... بەڵام من هەر لەسەر قسەی خۆم سوور بووم.

ساڵێك دەبوو هاتبوومە ئێرە لە کۆلێژی کارگێڕی دەمخوێند لەڕاستیدا لەژێر پەردەی خوێندندا، بەدوای ئەو دونیا ئەفسوناوییەدا دەگەڕام کە چەندین ساڵ بوو بە حەسرەتەوە لە هەرێمی ڕاستگۆیی و سەر ڕاستی دا عەوداڵی بووم. بۆ ئەوەی بچمە ناو ناخی خەڵکانی ئەو شارەوە، بڕیارم دا لەبەشی ناوخۆیی حکومی زانکۆکەم بمێنمەوە ڕازیش نەبووم بەو پارەیەی باوکم ویستی لەپێویستیەکانمدا خەرجی بکات، ویستبووی خانووی تایبەت و خزمەتکارم بۆ دابین بکات.

ئارەزووم دەکرد لەناو کچەکانی ئەنادۆڵدا بەتێکەڵی و ناسینی ئەوان لەکەش و هەوایەکی دوور لە بەرژەوەندی دنیاییدا هەست بە نزیکی دۆستی ڕاستەقینە بکەم.

هەر ئەوەشم کرد....

زۆر بەخێرایی کەوتمە تێکەڵاوی لەگەڵ ئەو کچە هەژارانەی کە لە زانکۆ ناسینم بەجیهانی خاوێن و ساکاری ئەوان ئاشنا بووم، لەوانەیە

ئـەوان هـیچ توانـاو دەسـەڵاتێکی ماددیـان نـەبوبێت بـۆ ژیـانێکی دەوڵەمەندانەی پڕلە نیعمـەت، بـەڵام نیـەت پـاکی لەپێکـەوە بـوون و هاوڕێیەتی ڕاستەقینەیان کە لەدونیای خۆیاندا ژیانێکی ئەفسـوناویان دروسـت کردبـوو زۆر کاریگـەری لەسـەرم هـەبوو... ئیتر بـەر لـەوەی منیش چێژی ئەو ژیانە خۆشەو ئەو دنیا پاکەی ئەوان تام بکـەم، لـەو سەرما سڕکەرەی زستاندا خۆمم لەسەر شـەقام بینییـەوە. لەوکاتـەی بە جەستەکی سوتاوەوە لەسەر شەقام کەوتبومە ژێر چنگی سـەرمای سڕکەری زستان و خەریك بـوو ڕەق دەبوومـەوە، لەگـەڵ فریشـتەیەك ڕوو بەڕووبوومەوە، کە خانمی پیری پەرستار" پورە فاطمە"بوو

هـەموو ئەمانـە خـەیاڵ بـوون! یـان خـەونم دەبینـی؟ بـۆ ئـەوەی تێبگەم ئەمانە تاچەند ڕاستن! دەستم لە پوورە فاطمەدا، ئەو خانمـە پیرە کە باشترین خانمی دنیا بـوو، لەناخیـدا جگـە لەخۆشەویسـتی و یارمـەتی شـتێکی تـر جێـی نـەدەبوەوە، بـۆ ئـەوەی دڵنیـا بێـت کـە دەمـەوێت شـتێك بڵـێم خێـرا ڕووی بـەرەو لای مـن وەرگێـڕاو هـەموو میهرەبانی خۆی خستە کار:

- قوربانت بم، شتێکت دەوێت؟

خۆم فڕێ دایە ناو نیگا ئەفسوناویەکانیەوە، کـە هـەموو هەسـت و هۆشی مرۆڤی بەئاگا دەهێنایەوە، خودایە چیم نەدەبەخشی بۆئەوەی هەموو ژیانم لە سایەی ئەو میهرەبانیەدا بمێنمەوە!!

بۆ یەك ساتیش بێت جێی نەدەهێشتم، وەکو پەروانە لەدەورم بوو یارمەتی دەدام.

– ئێستا برسیت بووە ئەزیزەکەم دەی پێم بڵێ چی دەخۆی؟ شۆربایەکی گەرم.. ناوساجیشم ئامادەکردووە لەگەڵ دۆشاوی تریێ، دەی پێم بڵێ حەز بەچی دەکەیت؟ سەرەتا هەندێ بەرووت بۆ ببرژێنم، دواییش تێکەڵەیەکت بۆ ئامادەبکەم کە إن شاء الله ببێتە شیفا بۆت، بەیانی بەلەشی ساغ هەڵدەستیت، هیچ خەمت نەبێت.

ئەمانە چی بوون خودایە!

لەژیانمدا نزیکی و دۆستی و گرنگی پێدانی لەو جۆرەم نەدی بوو چیت پێ بڵێم پوورە فاطمە چی؟! تەنها شت کە دەتوانم بیڵێم ئەوەیە چی دەبێت ئەوانەی کە بەناوی دڵخۆشییەوە باوەشیان بە ماددەدا کردووە بابێن و لەم دوورگە فراوانەی ڕۆحی تۆدا شیفا وەربگرن!

نەیدەزانی چۆن پەرۆشی خۆیم بۆ بەیان بکات.

– گەرم بوویتەوە شیرینەکەم.

– گەرم بوومەوە پووری، زۆریش گەرم بوومەوە.

بەڕاستی زۆر گەرم بوو بوومەوە بەجۆرێك ئەو گەرمیە بەناو هەموو لاشەمدا بەرەو ناخم پەلی کێشابوو تەنانەت ڕۆح و دەروونی ماندوشمی لەجیهانی مەعنەویاتدا حەساندبووەوە، ئازارەکانمی کەم کردبوەوەو تیماری برینەکانمی کردبوو.

– ئازارەکانت سوك بوون ڕۆڵەکەم؟

- زۆر باشم پووریّ، تۆ هیچ خەمت نەبێت.

ڕووخساری کە لە وەفاو خۆشەویستیدا دەدرەوشایەوە، دڵ و دەروونی کە بەمیهرەبانی فەتح کرابوو، منی بەرەو جیهانێکی ئەفسوناوی پڕ خۆشەویستی هەڵدەفڕاند ، کە چەندین ساڵ بوو بۆی دەگەڕام... ئەوە بوو دۆستی ڕاستەقینە.

ئەمە بوو کە خێزانەکەم بەتایبەتی باوکم نەیدەزانی و تێی نەدەگەیشت چونکە ئەوان بۆچوونیان وابوو کە خۆشی لەپارەو هێزو سەروەتدایە، بەڕاستی لەو درەنگانەی شەودا و لەو خانووە دارینە بچوکەداو لەتەنیشت ئەو زۆپا تەنەکەیەوە ژوورەکەی گەرم کردبوو هەموو ئازارەکانم سارێژ بوو بوون.

ئەو نزیکیەی کە پوورە فاطمە لەماڵەکەیدا نیشانی دام، ئەوەندە دۆستانەو بە چێژ بوو کە من لەو دەوڵەمەندیەمەوە هاتبووم لە ئەنادۆڵ بیبینم، لە ماڵێکی دوو ژووری دا دۆزیمەوە.

تا لەبەیانی نزیک دەبوینەوە ئازارەکانم زیادیان دەکرد، لەبەر ئەوەی تەداوی برینەکانم لەلایەن پوورە فاطمەوە زۆر سەرەتایی بوون و لەگەڵ تێپەڕ بوونی کات کاریگەری دەرمانە ئازار شکێنەکان کەمدەبوونەوەو هەموو گیانم کەوتە ئازار. ئەگەر باوکم بیبیستایە لە چ حاڵێکدام هەموو شارەکەی هەڵدەستاند لەبەرئەوە بە نیازنەبووم باوکم ئاگادار بکەم، ئەو برین و ئازارانەی بەهۆی ئاگر کەوتنەوەکەوە لەجەستەمدا دروست بوو بوو، ئێستا هەستم پێ دەکردن و ئازارەکانم

دەچەشت، کاتێك پووره فاطمه هەستی بەو حاڵەم کرد خەمخۆری و پەرۆشی زۆر زیادی کرد:

– هەرئێستا دەبێت بتگەیەنینە نەخۆشخانە رۆڵەکەم، لە رواڵەتدا شتێکی وات نیە، بەڵام لانی کەم ئازار شکێنێکت پێ دەدەن بۆئەوەی کەمێ ئارامت بکاتەوە.

## ئەو گەنجەی خاوەنی هەموو ئەدەبێك بوو:

مستەفای من کە هەواڵی ئاگرەکەی بیست خێرا چووە دەرەوە، خەمت نەبێت بەپەلە دەتگەنینە نەخۆشخانە هەرچەندە زۆر قەرەباڵغە بەڵام کێشە نیە، هەموویان دەناسم یارمەتیمان دەدەن چونکە تەمەنێك لەوێ خزمەتم کردووە.

خودایە ئەمە چ مرۆڤ دۆستیەك و چ رۆحێك بوو؟! دەستی لێ بەرنەدەدام، فرمێسکی چاوەکانمی دەسڕی کە لە بەر ئازار لەچاوم دەهاتنە خوار، شتێك نەمابوو لەدەستی بێت و بۆم نەکات.

لەو ساتەدا نازانم چۆن بوو چاوم لە دیوارەکەوە کەوتە سەر کتێبخانەیەکی بچوکی ناو ژوورەکە کە کتێبی عەرەبی و ئەڵمانی و ئینگلیزی و رووسی تێدا بوو، ئەو کورە تێگەیشتووە دەبوو کەسێکی خوێندەوار بێت، مەگەر دەکرێت لەم ماڵۆچکەیەدا کە تەنها لە دوو ژوور پێکهاتووە گەنجێك هەبێت ئەو چەند زمانە بزانێت؟! لەڕاستیدا سەرەتا بەمە زۆر سەرسام بووم، من واتێگەیشتبووم ئەو کەسانەی لە

ماڵۆچـکەی وەهـادا دەژیـن تـەنها بڕوانامـەی سـەرەتاییان هـەبێت لەگەڵیشیدا ئیشـی سـەر پێی بکـەن، پێشـتر واگومـانم دەبـرد، بـەڵام کاتێك هاتمە ئەم ماڵە، تەنها لەبەرامبەر ئەمان و ئەم گەڕەك و شارەدا نا، بەڵکو لەبەرامبەر ژیانـدا ڕوانینـەکانم گۆڕان، ئـەم خانۆچکە یـەك نهۆمە گڵە، ئەو دڵخۆشیەی تیایدا دەستت کەوت کە پاشاو گەورەکان لە جیهاندا بۆی دەگەڕێن کەلوپەلەکان ئەوەندە بـە شـێوازێکی جـوان ڕێکخـرا بـوون کـە ئـەو دوو ژووره وەك بەهەشـتی سـەر زەمینیـان لێهاتبوو، پاش کەمێك لەدەرگا درا دەنگی پووره فاطمـەم بیسـت کـە بەخۆشەویستیەوە بەرەو کردنەوەی دەرگاکە دەچوو:

– کوڕم فەرموو.. میوانمان هەیە، وەره ژوورەوە، دەزانیت خوشـکت بۆ پەیدا بووه، ئای خودایە! چـەندە لەدڵـەوە ئـەو قسـانەی دەکـرد، چەند دڵسۆزانەو بەڕێزەوە میوانداریان دەکـرد، دایـك و کـوڕ پێکـەوە چەند حەزیان بەیارمەتیدان بوو!

– سـەرمات بـووه ڕۆڵەکـەم.. وەره زۆپاکـەم گـەرم کـردووە هـەوای ژوورەکە گەرمـە، خواردنیشـم ئامـادەکردووە ئـەوەی کـە پێـی دەوت "کوڕم" هاتە ژوورەوە و چاومان بەیەك کەوت.

ئای خودایە! چ ڕوویەکی بێگـەردو وەسـتانێکی ڕێـك و ئـەدەبێکی بێ ئەندازەی تیا بەدی دەکرا.

لەڕاستیدا زۆر سەرسام بووم بە بینینی، بەڵام ئـەو کـە لـە شـەرما ڕووخسـاری سـوور هەڵگـەڕاو سـەری دانەوانـد، بەتـەنها بینینـی ئـەو

ئەدەبە زۆرەی ئەو منیشی شەرمەزار کردو هەموو لاشەم لەشەرمان ئارەقی دەکرد.

نازانم بەمە دەوترێت بروسکەی عەشق ...! کە من تێی کەوتم و، تیایدا ونبووم...

تەنانەت بۆ منێك کە بە ئازادی و لە خۆشگوزەرانیدا ژیابووم و تەمەنم لە نێوان کوڕاندا بەسەر بردبوو، ئەم دیمەنە بێ وێنەبوو.

لەگەڵ ئەوەی دەمتوانی لەنێوان کەسە هەڵبژێردراوەکاندا بم و بەدڵی خۆم هەڵبژاردن بکەم بەڵام هەرگیز حاڵەتی لەو جۆرەم نەبینی بوو، دەبوو بەوە بوترایە چی.. کە ئاوی خوڕی دەوەستاندو عەقڵی سەراسیمە دەکرد بەوە بوترایە چی کە تەمەنێکی درێژی لە چەند چرکەیەکدا کۆدەکردەوە، ئەو گەنجێکی باڵا بەرزی، گەنم ڕەنگ بوو.. کە تەنها بە ڕوانینەکانی هەموو قسەو هەستە خاوێنەکانی ناخی دەدرکاند وەستانەکەی بۆ خۆی ئەدەبێك بوو کە مرۆڤ پێی سەرسام دەبوو... لەچاوەکانیشیدا هەموو شەرم و ڕێزو ڕاستییەك دەخوێنرایەوە.

خودایە! نەکا ئەوەی من مەملەکەت بە مەملەکەت و شار بە شارو ناوچە بە ناوچە بۆی دەگەڕام ئێرە بێت!! ئەی ماناو عەشق و گەنجێتی ژیانیشم دەبێ ئەم لاوە بێت؟! لەو حاڵە پەرێشانەمدا خەریك بوو لەهۆش خۆم دەچووم، هەستەکانم دەفڕین و دڵم ئۆقرەی لێ بڕابوو.

من خەریك بووم چیم دەكرد؟ بەخۆمم وت" ڕاوەستە""ئارام بەرەوە! تۆ كێیت و ئەمانە كێن؟ كچی پیاوێك كە دنیای لەبەردەستدایە خەریكە لەماڵێكی دوو ژووریدا ژیانی سەرەو ژوور دەكۆڕێت؟! بێ دەنگ بە بێ هۆش... واز لەم بیركردنەوە سەیرانە بهێنە.... بەرلەوەی زیاتر خۆت بچوك بكەیتەوە، لەم ماڵە بچۆرە دەرەوە".

ئەو كاتەی من سەرقاڵی ئەو گەردەلوولانەی ناو خەیاڵی خۆم بووم، پوورە فاطمە :

– كوڕم، خێراكە دەبێت ئەم كچەمان بگەیەنینە نەخۆشخانە، بێ هیچ ناڕەزاییەك وتی:

– بەسەر چاو دایە گیان... هەر ئێستا...

مستەفا تەنانەت بێ ئەوەی سەیری ڕووخساریشم بكات، هەر ئەوەندە وتی" خودا شیفات بدات" و وەكو فریشتە بەئارامی لە ژوورەكە دەرچوو، چەند سەیر بوو سەرەڕای ئەو پێداگریەشم كەچی عەقڵ و هۆشم لەگەڵ ئەو ڕۆیشت.

ئەو گوێڕایەڵیەی مستەفاش بەرامبەر دایكی بەجۆرێكی تر منی سەرسام كرد، یەكسەر خۆم خستە جێی ئەو، ئەگەر من بومایە چەندە دایكم بەڕەخنەو ناڕەزاییەكانم تووشی ئازار دەكرد، ستەمم لێ دەكرد! بەڵام مستەفا بێ ئەوەی یەك وشەش بڵێت گوێڕایەڵی دایكی كرد. ئەو دەرچووی ئامادەیی زانستە ئیسلامییەكان بوو، دوای

تەواوكردنی ئەو خوێندنگەیە چووبووە " ڤیەنا" بۆ خوێندنی بەرزتر لە زانكۆو بەشی كارگێڕی خوێندبوو.... دواتریش زمانی ئەڵمانی و ئینگلیزی و عەرەبی و ڕووسی وەك زمانی دایك فێربووبوو.

دوای ئەوەی گەڕابوویەوە بۆ توركیاو ئاگاداری لەدەست دانی باوكی بووبوو، ئیتر دایكی بەتەنها جێ نەهێشتبوو و نەچووبوویەوە بۆ دەرەوەی وڵات، لەو بەشەی منی لێ بووم سەرقاڵی خوێندنی دكتۆرا بوو. واتە گەنجێك بوو چەند ئاستێك لەمن بەرزتر بەدەر لەوانەش لە مزگەوتی گەڕەكەكەیاندا ئیمامەتی دەكرد، كاتێك ئەو چیرۆكە كورتەی ژیانیم لە دایكیەوە بیست زۆر تێڕامام، ئەوانەی دەمبیست باوەڕ پێنەكراو بوون.

لەناو خانۆچكەیەكی گڵێندا لەجێی كرێكارێك، خزمەتكارێك یان پیاوێكی هەژار، خوێندكارێكی دكتۆرا دەژی...لەگەڵ ئەوەشدا خوێندكارێكی زیرەك كە چوار زمان دەزانێت.

كە لە لێكدانەوەی ئەم خەیاڵانەدا بووم، لەدەرگا درایەوەو مستەفا هاتە ژوورەوە... باوەڕ بكەن، زۆر هەوڵمدا چاوم بكەوێتە سەری و هەست بەو كاریگەریە سەیرە بكەم كە لەسەر من جێی هێشت بوو، بەڵام ئەو بۆساتێكیش دەرفەتی نەدا چاوەكانی ببینم.

وەك ئەوەی تەقەلا بدات كە لەتەماشای من ڕزگاری ببێت وەكو منداڵێك سەری دانەواند:

– فەرموون... ئەمبولانس چاوەڕێمان دەكات.

هەستێکی نامۆ لەناخمدا چرۆی دەکرد:

لەو خانۆچکەیەی کە بەترسەوە چوومە ژوورەوە، بەئومێدو ئارامیەکی زۆرەوە هاتمەدەر، لەدەروونیشمدا ئەو هەستە سەیرانەم کەم کەم بەرەو گەردەلوولێك لە سۆز دەگۆڕان، لەکوێ بمزانییایە ئەو خانۆچکە دوو ژوورییە دڵ و دەروونم سەرەو ژوور دەکات! ئەو ماڵە... ئەو هێلانە ئەفسوناویە..ئەو هەرێمی ئارامییە.. کاری لەهەموو گەردەکانی جەستەم کردبوو، ئیتر لەبیرکردنی ئەو جێیە بۆ من ئاسان نەبوو!. من لەوێ دا بەخانمێك گەیشتم کە سۆزی دایکایەتی پێ بەخشیم، هاوکات لاوێکم ناسی کە خەیاڵ و دڵ و مێشکمی داگیر کرد ئیتر لەبیرکردنی ئەمانە کەی ئاساییە؟! سەرەڕای ئەوەی قەرزاری ئەو هەموو زەحمەتەیان بووم.

کاتێك سواری ئامبولانسەکە بووم، هاوارێك لەناخم هەستا:" من بەجێ مەهێڵن، من ئێوەم زۆر خۆشویست" بەڵام کەس ئەو هاوارەمی نەبیست.

ئەمە چ جیابوونەوەیەك بوو خودایە؟ هۆشم پەرت و بڵاو، هەستەکانم پارچە پارچە جەستەشم پڕ ئازار پەرێشان مابووم زۆر باش تێگەیشتم کە ئەم کارە لێرەدا کۆتایی نایەت، بەڵام ئاگاداری ئەو"سوپرایز"ە بەرگە نەگیراوانەش نەبووم کە چاوەڕێیان دەکردم.

که چووبوینە ناو نەخۆشخانەکەوە، ئەو پەرستارەی پێشوازی کردبوو پرسیاری لە ناوی من کردبوو، هەر ئەوەندەی وتبویان"ئیلکای" زۆر بەگرنگیپێدانەوە هەستابووە سەرپێ و هاواری لە بەڕێوەبەرەکەیان کردبوو:

– هات گەورەم...هات.

یەکسەر هەمووان گەیشتبوونە پشت سەرمان. لەبەرامبەر ئەو حاڵە چاوەڕوان نەکراوەدا سەرمان سوڕمابوو، دیارە باوکم هەر ئەوەندەی هەواڵی ئاگرکەوتنەوەکەی بیستووە خێرا بەدوای مندا گەڕاوە، کاتێك منی نەدۆزیوەتەوە هەواڵی داوەتە شوێنە گشتیەکان، لەبەرئەوە لەنەخۆشخانەکەش وەك بڵێی هەموو لەچاوەڕوانی مندا بوون، لەناو دەیان کچی گەنجدا کە چارەسەری پەلەیان بۆ دەکرا کاتێك لەچوونی من ئاگادارکران، پزیشکی تایبەت نێردراو لەژووری تایبەت دانرام، بەجۆرێك کچە هەژارەکانی ناو بەشە ناوخۆییەکە پەرستارەکان لەگەڵیان خەریك بوون و ژوورەکەی منیش پزیشکەکان یەکێك دەهات و ئەوی تر دەڕۆیشت. هەر ئەم جیاکردنەوەو دوور خستنەوەیەش بوو لەوانی تر کە منی والێکردبوو سەرپێچی ماڵەوە بکەم، زۆری پێ نەچوو سەرۆکی شارەوانی و بەڕێز پارێزگار هاتنە ژوورەکەم، هەمووان دەهاتن و دەیان وت: " واتە تۆ کچی " بەڕێز عەقیل" یت و نەمان زانی بوو! جەنابی پارێزگار وەك ئەوەی خۆی بەتاوانبار بزانێت کە بەئەرکی خۆی هەڵنەستاوە:

– کچم ئێمەت ئاگادار بکردایە، لەمیوانخانەیەکی تایبەت خزمەتمان دەکردیت، بۆچی ئاوا ڕازی بویت بچیتە ئەو ناوخۆییەی بە خوێندکار ئاخنراوە !. بەزەردەخەنەیەکەوە کە لای من زۆر تاڵ بوو وتی:

– ئێمە وەك شازادەیەك مامەڵەمان لەگەڵ دەکردیت و، ئەو ڕووداوەشت بەسەر نەدەهات، جەنابی پارێزگار چۆن بیزانیایە کە من لەناو ئەو هەموو نازو نیعمەتەدا هەستم بە هیچ ئاسوودەییەك نەدەکرد! جا ئەگەر بیشیزانیایە باوەڕی پێ دەکرم؟ یاخود لێم تێدەگەیشت؟!

بەیانی بوو لەناو دەنگە دەنگی نەخۆشخانەدا هەستم بەبیستنی دەنگی دایك و باوکم کرد، باوکم کە هەمووان لەبەری دەلەرزین، بەچەپ و ڕاست دەبوو هەموو شت بەدڵی ئەو بێت، کاتێك هاتە ژوورەکەوە وەك ئەوەی قیامەت هەستابێت ئیتر بێ دەنگ کردن و وەستاندنی ئەو مەحاڵ بوو. بەبیستنی هەواڵەکە بەخێرایی سوار فڕۆکە بوون و گەیشتونەتە ئەو شارەی کە منی لێبووم و لەوێشەوە بەرەو نەخۆشخانە...

– هاتنی باوکم بەتەواوی قەرەباڵغی دروست کردبوو سەرۆکی شارەوانی و جەنابی پارێزگار و بەڕێوەبەرو پزیشکەکانی نەخۆشخانە هەموو بەڕیز لەگەڵ ئەو پیاوە بازرگانە ناودارە هاتنە ژوورەوە، دایکم و باوکم کە منیان بەو حاڵەوە بینی بەرگەیان نەگرت.. دایکم لەو ناوەدا نەیدەزانی چی بڵێت. باوکیشم خۆی بۆ ڕانەدەگیرا

لەحەسرەتی ئەوەی ڕێگەی بەمن داوە ئەوەم بەسەر بێت، هەرچەندە پزیشـکەکانی نەخۆشـخانە ئـەوانیان لەباشـی تەندروسـتیم ئاگـادار بکردایەتەوە، بەڵام دایکم کە هیچ کات نەیدیوە خۆڵیش بـەر جلـەکانم بکەوێت هەرگیز ئەو قسانە بۆ ئەو بەس نەبوون.

## دەرکردنی پووره فاطمە:

پووره فاطمە کە وەکو پەروانە لەدەورم بوو لەلایەن دایکمەوە زۆر ئازاری پێ گەیشتبوو کە چاوەڕوان نەکراو بوو بۆ ئەو:

– ئـەم ژنـە خزمـەتکارە کێیـە لـەم بەردەسـت و پێیـە هـەر دێـت و دەڕوات؟! دەڵێی دەیەوێت کچەکەم قوت بـدات. پێـی بڵـێن خـەریکی کاری خۆی بێت، دایکم پووره فاطمەی بەخزمـەتکارێکی نەخۆشـخانە زانی بوو، پووره فاطمەش لەکاتێکدا چـاوەڕوانی سـوپاس کـردن بـوو نـەیزانی ڕووبـەڕووی هەڵوێسـتی لـەوجۆره دەبێتـەوە. بـەڵام هـیچ دەنگێکـی لێـوە نـەهات، ڕۆیشـتە سوچـێکی ژووره‌کـەو پـاڵی بەدیوارەکەوە دا، کاتێك ئەوەم بینی خەریك بوو ئاگرم دەگرت .

– دایکە تۆچی دەکەیت؟ ئەو پورێیـە، فاطمـە خـانی پەرسـتیارە کـە منی ڕزگار کردو گەیاندمیە ئێره، لەو کاتەدا کە هەمووان لەناو ئـاگری ئەوێدا سوتان، ئەو بووە ڕزگارکەرم و بەگیان و دڵ یارمەتی دام.

ئاخ دایکم بە لوت بـەرزی و کیبرێکـی زۆرەوە سـەیری سـەقفەکەی دەکردو ئەو ڕوونکردنەوەیەی بەشیاو نەدەزانی:

– واته تۆ لای ئەو فاطمە هەژارو کەم دەسەڵاتە ماویتەوە؟ ئەم کچەم کە هیچ دەستێك ئازاری پێ نەگەیاندوە لەم حاڵەدایەو منێ نەمزانیوە! بەم ڕوون کردنەوەیەی من، باوکم ئەوەندەی تر چاوی سوور هەڵگەڕا.

– هەر ئێستا دەبێت بڕۆین، ئێرە جێگەی تۆ نیە، ئەو کچەم کە لە چاوەکانم زیاتر خۆشم دەوێت موحتاجی دەستی کێ بووە؟! دەی هەر ئێستا دەڕۆین.

ئەمە جیاوازیەکە بوو.. ئەوە ڕێز و مرۆڤ دۆستی خێزانەکەی من بوو. ئەوەش دۆستایەتی و یارمەتیەکانی پوورە فاطمە چەند لەیەك دوور بوون، چەند جێی شەرم بوو، پوورە فاطمەی داماو سەرەڕای یارمەتی دانم هەر ئەوەندەی مابوو لێیشی بدەن. جگە لەوەی پوورە فاطمە ئەو هەستی ئارامی و خۆشیەی پێ بەخشیم کە هەرگیز لە ژیانمدا نەمدیبوو.

لەدەرفەتێکدا تەنها بەچاوەکانم بۆ مستەفا گەڕام، بینیم کە قۆڵی دایکی گرتووەو لە ژوورەکە دەیباتە دەرەوە، چەند سەخت بوو... خەڵاتی یارمەتیدانی من بۆ ئەوان دەرکردنیان بوو!

ئەو دایك و باوکەم کە لە دەرەوەی مرۆڤ دۆستی بوون، لەلایەن پارێزگارەوە دەستیان بۆ بەسنگەوە دەگیرا، کەچی دوو کەسی خێرخواز کە یارمەتی کچێکی بێ چارەیان دابوو ژیانیان ڕزگار کردبوو بەوجۆرە دەکرانە دەرەوە. ڕۆیشتنە دەرەوەی ئەو دایك و کوڕەی

تــەنها لــەپێناوی خــوادا یارمــەتی منیــان دابــوو. بــەلای منــەوە زۆر ناڕەحەت بوو، زۆر خــەمبار بــووم، نــاخم وەك پشــکۆ دەســووتا، ئــەو خەمــە دڵ و مێشــکمی تــەنیبوو، تەنانــەت قوڕگیشــمی پــڕ کردبــوو هەناسەم بۆ نــەدەدرا، ئەوەنــدە دڵــم تــەنگ بــوو، ئەوەنــدە خــەمبار بــووم، ئەوەنــدە ســووتام بــەو حاڵــە کــە ئــیتر خــۆم پــێ ڕانــەدەگیراو لەدڵەوە ئەوەندەی توانیم دەستم کــردە گریــان، خــەریك بــوو مێشــکم دەتەقی، ئەوەندە لە پەرێشانیدا بووم بیرم لەوە دەکردەوە یەکســەر لەجێگەکەم ڕاکەم و بکەومە سەر قاچەکانیان تــاکو هــەموو ســوتان و ناڕەحــەتی دەروونم بێتــە دەرو ئاســوودەبیم، ئــاگری دابــڕان لــەو دوو دۆستە هەموو هەستەکان و گەردەکانی لــەشمی داپۆشــی بــوو. زیــاتر بەرگەی ئەو لێکدابڕانە سەختەم نەگرت و لەهۆش خــۆم چــووم. لــەناو ئەو هەموو خەڵك و قەرەباڵغیــەدا نــەمتوانی هــیچ بــەو دایــك و باوکــەم بڵــێم کــە لــە قســەکانی نــاخم تێنەدەگەیشــتن، هەڵوێســتی لــەوجۆرە بەرامبەر ئەو دوو کەسەی لەناخۆشترین کاتی ژیانمدا دەستیان گــرتم، هیچ مرۆڤ دۆستی نەبوو...

ئــەوان میهرەبــانی و خۆشەویســتییان بــە مــن بەخشــی، کەچــی لەبەرامبــەردا بــەوجۆرە خــەڵات کــران! ئــازاری ویــژدان پەرێشــانی کردبووم، لەدوای گەڕانێکی زۆر بەدیداری دوو کەســی ســیما شــیرین و ڕاستگۆی وەکو ئەوان شــادبووبووم، بۆیــە لەدەســتدانیان بــۆ مــن زۆر سەخت بوو.

باوکم کە بڕیاری دا بەفڕۆکەی تایبەت بمبات بەهەموو هێزمەوە خۆم کۆکردەوە توانیم بڵێم:

– بەمەرجێك!

ئەویش پرسی:

– چییە؟

– لەدوای وەرگرتنی چارەسەرەکەم دیسان دێمەوە ئێرەو لەخوێندنەکەم بەردەوام دەبم.

بەتوورەییەوە:

– هەرگیز ... تۆ نابێت ئیتر ناڕەحەتی غەریبایەتی بچێژیت سەیری حاڵی دایکت بکە، لێرەدا تەواوی دەکەین. لێرە بەردەوامی بەخوێندن نادەیت.

باوکم ئیتر ئاگای لەخۆی نەمابوو لە توورەییدا ئەوەی لەدەمی دەهاتە دەر دەیوت. تەنانەت وشەی ناشیرینیش.

منیش وتم:

– لانی کەم بۆ سوپاس کردنی ئەو دوو مرۆڤە خێرخوازە دووبارە دێینەوە بۆ ئێرە، ئەگەر نا یەك هەنگاویش نانێم، لەنەخۆشخانە هاتینە دەرەوە سواری ئۆتۆمبێلی تایبەتی بووین، باوکم ماڵئاوایی لەوانی تر کردو ڕێگەی ماڵەوەی گرتەبەر.

کاتێك گەیشتینە ئەو گەڕەکە هەژار نشینانە باوکم ڕووی وەرگێڕا نەیدەتوانی هیچ پەیوەندیەك لەگەڵ ئەو جۆرە کەسانەدا دروست بکات:

- ئەمانە مرۆڤی هەل پەرستن... برسی و بێ چاوو ڕوون...بەدوای یەك دینارەوەن، کچێکی خانەدانی وەکو تۆ ببینن چۆن ناکەونە دوای! بێ گومان لەبەر ئەوەی بەدوای پارەوەن من ئەمانە باش دەناسم، سەرەتا بەزەردەخەنەو نەرمیەوە دێنە پێش، دواتر هەزار داواکاری دەخەنەڕوو و پارەت لێ دەکێشنەوە.

ئاااى کچی بێ ئەزموونم! هێشتا زۆرت ماوە ئەم جۆرە کەسانە بناسی...

دڵم لەناو قەفەسی سنگمدا پەلەقاژەی بوو، زۆر بێزاربووم هیچ ئامادەی بیستنی ئەو قسانەی باوکم نەبووم، دووبارە شادبوونەوەم بەوان تەنها حەسرەتی بەرگە نەگیراوی دڵم بوو کە پێش هەموو شتێك بۆم گرنگ بوو. لەوتنی " ئاخ و ئۆف" زیاتر هیچم پێ نەدەوترا، نەمدەتوانی شتێك بکەم. لەماڵی ئەوان نزیك بووینەوە، نەمدەتوانی بەسەر خۆمدا زاڵ بم، لە پەرۆشیدا دەلەرزیم، ئێمە وەستاین و پۆلیسی هاتوچۆ خەریك بوو ڕێگەکەی پێ نیشان دەداین لەو کاتەدا دایك و کوڕم پێکەوە بینی کە گەیشتنە لای ئۆتۆمبێلەکەی ئێمە.

## ئەو دوو دڵە فارەمانەی پێکەوە چنرابوون:

لەبەرامبەر ئەو دوو کەسە بێ گەردو یارمەتی دەرەدا، خەریك بوو لە شەرمەزاریدا دەتوامەوە، زۆر پەرێشان بووم بۆ ئەو دوو مرۆڤەی کە وەك پەروانە لەدەورم دەسوڕان، لێیانەوە فێری خۆشەویستی بووم و میهرەبانییەکیان پێ چەشتم کە هەرگیز تامیم نەدەزانی ئێستاش لەجیاتی سوپاس کردن بووم بە هۆکاری ئەو بارودۆخە ناخۆشەی بەسەریان دا هات، نەفرەتم لەخۆم دەکرد.

بەرلەوەی من دابەزم باوکم لەپێشەوەی ئۆتۆمبێلکە دابەزی و چووە لایان:

بەچاوێکی کەمەوە تەماشای کردن. زەرفێکی لەگیرفانی دەرهێناو بەدەست بۆی درێژ کردن:

- یارمەتی کچەکەمتان داوە، ئەو پارەیەی کە لەم زەرفەدایە بەزیادەوە قەرزی یارمەتیەکەتان دەداتەوە. ئای خوایە گیان! لەوێدا بەرامبەر ئەو هەڵوێستەی باوکم بەتەواوی لەشەرماندا خەریك بووم دەبورامەوە، ئیتر نەمتوانی دابەزمە خوارەوە، خۆزگە زەوی لەت ببوایەو منی تێبکەوتمایە لەو کاتەدا.

پوورە فاطمە کە تەنها میهرەبانیم لێ بینی بوو بە گورجی لەبەرچاوی هەمووماندا ئەو زەرفەی کە باوکم پێی دا دڕاندی و بە دەنگێکی لەرزیوەوە وتی:

– تەماشام بکە بەڕێز... سوپاس بۆ خوا ئێمە موسوڵمانین! پاراستنی لێقەوماوێك، ستەملێکراوێك، کەسێکی سەرشەقام بە پەرستش دەزانین، ئەمەش لەبەر ڕەزامەندی خوا دەکەین ئەم یارمەتیدانە بووەتە نەریتی خەڵکی ئەنادۆڵ.

ئەگەر کەسێك نەبوایە کە لەو کچە بپرسێتەوە نەك تەنها شەوێك، بەڵکو تەمەنێك وەکو منداڵی خۆمان دەمان پاراست بەسەیرکردنی گەڕەکەکەشمان ئێمە بە سواڵکەری پارە تێمەگەن، ئێمە هێشتا ئەوەندە بچووك نەبوینەتەوە کە شەرەف و کەرامەتی خۆمان بە پارە بفرۆشین بەڕێز! بەڵام تێگەیشتنتان لە مرۆڤایەتی ئاوایە، زۆر بەداخەوە... پوورە فاطمە کە لەپەرۆشیدا لەسەر خۆی چوو بوو، پەنجەکانی درێژکرد بۆ چاوی باوکم و لە تووڕەییەکەی بەردەوام بوو:

– ئێستاش لەبەرچاومان ون بن، لێرە مەمێنن، بەقاچە پیسەکانتان ئەم کۆڵانە بێگەردانە مەشێوێنن، باوکم بە هەموو تەمەنی ئەم قسانەی نەبیستبوو، منیش وەکو بێ هۆشێك لە ئۆتۆمبێلەکەدا بەحەپەسانەوە دەمڕوانی، باوکم هیچی پێ نەوترا و بەبێ دەنگی هاتەوە ناو ئۆتۆمبێلەکە، غیرەت و چاونەترسی پوورە فاطمە هەموومانی سەرسام کرد، جەنابی پارێزگار کە لەگەڵ ئێمە بوو.

هەوڵیدا باوکم بپارێزێت:

– خانمی بەڕێز تۆ دەبێت ئەم پیاوەت نەناسی بێت کاک (عەقیل)، بازرگانی بەناوبانگی جیهان، چۆن بەم جۆرە قسەی لەگەڵ دەکەن؟ دەیەوێت یارمەتیتان بدات، ئەمە کوێی خراپە؟

پووره فاطمه بەهەمان تووڕەییەوە :

– ئەو بووەتە بازرگان، بەڵام نەبووەتە پیاو، ئێوەش کێن کە لەبەردەم مندا پارێزگاری لێ دەکەن!

– من پارێزگاری ئێرەم.

– زۆر بەداخەوەم بۆ ئێوەش، کەسانی وەك ئێوە نابنە نموونەی خەڵکی ئێرە، تۆیان بەهەڵە ناردۆتە ئێرە باشتر وایە ئێوەش بڕۆن لەم شارە. ئەفسەرەکان هاتنە ناوەوە ویستیان پووره فاطمه بێدەنگ بکەن، بەڵام ئەو بەتووڕەییەك کەلێی چاوەڕوان نەدەکرا وەکو شێر ڕوو بەڕوویان بوەوەو هیچ کەس نەیدەتوانی لێی نزیك ببێتەوە. من ئیتر بەرگەم نەگرت لەئۆتۆمبێلەکە دابەزیم و باوەشم کرد بەدەستەکانیدا:

– بمبوره پووره فاطمه من کچی ئەم پیاوەم، بەڵام وەکو باوکم بیرناکەمەوە، هەرلێرەدا لەبەردەمتاندا شەرمەزارو غەمبارم، من بوومە هۆکاری هەموو ئەمانە، تکا دەکەم بمبەخشن هەرگیز ئێوە لەبیرناکەم، باوکم بەتوندی قۆڵی گرتم و ڕایکێشامە دواوە لەوکاتەدا چاوم بە مستەفا کەوت، خودایە بەدیداری ئەو دەتوامەوەو مەست و بێ هۆش دەبووم.

## هەرگیز ئەو دایك و كوڕە لەبیر ناكەم:

منیان فڕێدایە ناو ئۆتۆمبێلەكەو لەوان دووریان خستمەوە. بەهیچ شێوەیەك ماڵۆچكەكەی پوورە فاطمەو ڕووخسارە خەمبارەكەی مستەفا لەبەرچاوم لانەدەچوو، ئەی ئەو فەرمایشتەی پوورە فاطمە كە وتی: "كچم قسەكانم بۆ تۆ نییە" وەكو خەنجەر ناخمی دەبڕی لەدڵمدا هاوارم دەكرد:

" خودایە لەم ئیشەدا هەڵەیەك هەیە"، " من لەخانووە بەشەوكەتەكەی كاك عەقیل نا، بەڵكو لەم هێلانە بچوكەدا دڵخۆش دەبم، چی دەبێت بامن لێرە بمێنمەوە؟!"

باوكم لەناو ئۆتۆمبێلەكەدا هەر بۆڵەبۆڵی بوو:

- من خۆم لەژیانمدا دوو كەسم هیچ كات خۆش نەویستووە یەكەمیان: ئەوەی باسی دین دەكات، دووەمیان: كەسی بێ چاوو ڕوو كە لەبەرامبەرتدا دەوەستێت و دەوێرێت قسە بكات...

یەكێكیان، پەرستیارێكی خانەنشینە كە خۆی بە هەموو شتێك دەزانێت، ئەوی تریشیان گەنجێكی دواكەوتوو كە ئیمامەتی مزگەوت دەكات.. ئەمانە هاتوون و میوانداری كچەكەی ئێمە دەكەن.

من ئەمە بە سوكایەتی دەزانم، شتی وا هەر نەبووە.

ئەمجارە جەنابی پارێزگار كەوتە قسە:

– کاك عەقیل، وابزانم کەمێك پێوەرەکانمان تێکەڵ کردووە سبەینێ ئەم هەواڵە ببیسترێت، لەبەر چاوی خەڵك بچوك دەبینەوە، یاساو پێوەرەکانی ژیان لێرە: لەسەر نەرمی و خۆشەویستی و باوەڕ دروست بوون، هەڵەیە ئەگەر ئێرەو پاریس و لەندەن بەیەك چاو سەیربکرێن، پاشانیش ئەو ئیمامەی ئێوە بەبچوك بینیتان لە زانکۆی ڤیەنا خوێندویەتی ئەڵمانی و ئینگلیزی و عەرەبی و ڕووسی دەزانێت، ئێستاش دکتۆرا دەخوێنێت لەبواری کارگێڕیدا کەسێکی شارەزاو لێهاتووە لەناکاو ڕوانینەکانی باوکم گۆڕا کاتێك زانی ئەو ئیمامە کێیە:

– کەواتە بەم جۆرەیە، خۆزگە ئەمانەت پێشتر بوتایە تکایە بابگەڕێینەوە بەڵکو لەگەڵی ئاشت ببینەوەو سوود لە ئەزموونی پسپۆڕیەکەی وەربگرین، من پێویستم بە ئەندامێکە ئینگلیزی یان ڕووسی بزانێت، جا ئەگەر گەنجێکی ئاوا بەڕەوشتیش بێت بۆ من باشترو گونجاوترە. باوکم لەهەر شتێکدا کە پەیوەندی بە بەرژەوەندی و پارەوە هەبوایە ئاوا بەخێرایی دەگۆڕا. ئەمە خووی ئەو بوو ئەگەر بەرژەوەندی تێدا بوایە لەگەڵ دوژمنی چل ساڵەیدا قۆڵ لەناو قۆڵ پیاسەی دەکرد.

جەنابی پارێزگار دووبارە هاتەوە ناو باسەکە:

– ئەم کەسانە خاوەنی کەسایەتیەکی زۆر بەرزن ئەوەی پێش ئێستا ڕووی دا پێیان قبوڵ ناکرێت. با ئەم داوایەت بۆ کاتێکی تر بێت،

باوکم بەزۆر قەناعەتی کرد، بەڵام هەر دەستبەردار نەدەبوو من باش ئەو دەناسم.

لەناو هەموو ئەوانەی کە ڕوویاندا خۆمم ون کردبوو، ئەوەی لەبەرامبەر ئەو مرۆڤانەدا کرا هیچ کات پێم قبووڵ نەدەکرا ئاگرەکەی ناخم وا دەیسوتاندم کە برینەکانی خۆمم تەواو بیرچوبوویەوە، خەفەتم بۆ ئەوان دەخوارد، بۆ ئەوەی باوکم نەزانێت فرمێسکەکانم دەشاردەوەو هاوارەکانی ناخم بەبێدەنگی دەردەبڕی.

ئەو چاوە ئازایانەو دەستە پڵنگ ئاساو وتە ئاگرینانەی پوورە فاطمە هی بیرچوونەوە نەبوون!!

ئەی وەستانی مستەفا، بەهەموو ئەدەب و پیاوەتیەوە بەڕێزو بێدەنگیەوە منی حەیران کردبوو. دایك و کوڕ وەکو قارەمانی ناو داستانێك بەردەوام خەیاڵەکانمیان دەڕازاندەوە. بەجۆرێك سەرم بۆ هەر کوێیەك دەسوڕاند ڕووی ئەوانم دەهاتەوە پێش چاو.

## خۆشەویستیەکەی ناخم ڕەگی دادەکوتا:

کە گەیشتینەوە شارەکەی خۆمان باوکم منی گەیاندە باشترین نەخۆشخانە، بەردەوام پزیشك و پەرستار لەپشت سەرم ڕادەوەستان، هەموو شتێك هەبوو، لە هەر داواکاری و پێویستیەکمدا ئامادە بوون، بەڵام ئەم ساردو سڕییە، ئەم دنیا دەستکردە دیسان منی غەمگین و دڵتەنگ دەکرد. بەردەوام لەخەیاڵی نزیکی و

دۆستایەتی و گەرموگوڕی ئەو خەڵکە غەریب و دڵپاکەی ئەنادۆڵدا بووم.

ئەو کچە هەژارانەی کە لە بەشە ناوخۆییەکەدا پێکەوە بوین، خۆشەویستی ئەوان کاریگەری زۆر بوو لەسەرم. دۆستایەتی ئەوان گفتوگۆو نەرم و نیانیەکانیانم هیچ لەبیر نەدەکرد. ئەی ئەو کاتانەی دەچووم بۆ شت کڕین، لەو شارە بچوکەدا هەستت دەکرد لەفراوانترین جێگەدایت بەهۆی ئەو میهرەبانیە زۆرەی لە خەڵکەکەیدا دەتبینی.

"ئەمرەکەی... بەسەرچاو... خوا لێت ڕازی بێت... ئەو قسەیە مەکەن، چۆن پارە لە ئێوە وەردەگرین؟!... کەی توانیت ئەوکات نرخەکەی بدە سەرت سەلامەت"....

خودایە ئەم وشە شیرینانەیان چی بوو، وەك بڵێی ژیانیان کردبووە بەهەشتی سەر زەمین.

ئەی پوورە فاطمەو مستەفا ! ئەوان دوو قارەمانی ژیانم بوون. دوو فریشتە بوون کە لەمێشکم نەدەسڕانەوە، لەخەیاڵم نەدەڕۆیشتن و، لە دڵم دەرنەدەچوون.

" نازدارەکەم، ئەمەش دەخۆیت؟ نازدارەکەم ئەمەش زۆر شیرینە...نازدارەکەم ئەوە لەبیر نەکەیت هەرچیت پێویست بوو دەبێت بیڵێیت...خۆشەویستی دایە، تۆ میوانمیت بەڵام من بەکچی خۆمت دەزانم"، من لەدایکی ڕاستی خۆیشم ئەوەندە خۆشەویستی و

سۆزی پاك و بێ بەرژەوەندی و گرنگی پێدانم نەبینی بوو، بەهەموو جۆرێك ئاسوودەیی و ئارامی و خۆشەویستی لەناخمدا دەڕواند، لە هەمووشی گرنگتر فێری خۆشویستنی کردم. ئیتر مستەفاش شتێکی تربوو لە ژیانمدا.

لەو شوێنەی لاوێتیم بەسەر بردبوو پڕ بوو لەکەسانی هەڵبژێردراوو کەسانێك کە هەمووان ئێرەییان پێ دەبردن، چەندین گەنجیش هەمیشە لەهەوڵی ئەوەدا بوون بۆ ساتێکیش بێت دەرفەتی قسەکردنیان پێ بدەم. بڕوا بکەن لەو بارەیەوە گەنج هەبوون کە ئەوەی لەدەستیان بهاتایە دەیان کرد بۆ گەیشتن بەمن، ئەوانە زۆریشیان کەسانی دەوڵەمەندو سەرکەوتوو لەخوێندن و خاوەن پلەو پایە بوون بەڵام لەچاوی هیچ کامیاندا ئەو ئارامی و ئاسوودەییەم دەست نەکەوت.

بەتەنها یەك بینین دەتتوانی تێبگەیت کە مستەفا چەندە لاوێکی بەئەمەك و ڕاستگۆو جیاوازە لەوانەی تر، هەر بۆیە بەشێوەیەکی جیاوازیش دەرروونی منی داگیر کردبوو کە دەرچوونی مەحاڵ بوو. من لەناو دەورروبەریشمدا بەجوان ناسراو بووم هەرگەنجێك منی دەبینی دووبارە ڕووی وەردەگێڕایەوە بۆ ئەوەی جارێکی تر بمبینێتەوە. تەنها گەنج کە ئەمەی نەدەکرد مستەفا بوو، ئەو تەنانەت لەکاتی ڕووبەڕووبونەوەشمدا هەوڵی دەدا چاوی لەبینینم بپارێزێت بەوەی کە وەکو نمونەی ئەدەبێکی بەرز ڕوانینەکانی بەرەو لایەکی تر

وەردەگێڕا، من خۆم لە پاکی و دروستی و کەسایەتی و ئەدەبی ئەو رامابووم. من لەئەودا جوانی ڕۆح و پیاوەتیم دۆزیبوەوە نەك ڕووکەش و جوانی ڕووخسار. بەجۆرێك کاری تێکردبووم، کە هەموو ڕۆژێك زیاتر لەپێشوو دەچووە ناخمەوە و هێندەی تر ئەوم جیاواز دەبینی و لەبیر کردنی ئەستەمتر دەبوو لەلام.

بەهۆی خۆشویستنی زۆری مستەفاوە خەریك بوو ئیتر گرنگیم بەکەسانی دینداری تریش دەدا کە تا ئەو ڕۆژەیش وەکو باوکم منیش خۆشیم لێیان نەدەهات، ئەو ئیتر نەك هەر لەخەیاڵمدا لەخەونەکانیشمدا جێی گرتبوو. شەوێك تا خەو چووە چاوم بیرم لەو دەکردەوە، لەپڕ لەبەردەمی خۆمدا بینیم، دیسان ئەو بەشەرم و سەرداخستن و هەڵهاتن لەبینینم خۆی نیشاندام. بەناڕەحەتیەوە پێم وت:

– من زۆر خەمبارم، تکایە بمبەخشن، بڕوا بکەن زۆر ئازار دەچێژم، هەرچەندە ئێوە شایەنی جوانترین و بەرزترین ستایش بوون، کەچی باوکم بێ ڕێزی بەرامبەر کەسایەتیتان کرد، منیش هیچ هەڵوێستێکم نەنواند. بەڵام ئێوە لەوکاتەشدا بەجوانترین شێوە مرۆڤ بوونی خۆتان پاراست. دیسان هیچ وەڵامی نەدایەوە، ڕووی وەرگێڕاو خەریك بوو دەڕۆیشت، منیش وەکو دوا دەرفەت لەبێ چارەییمدا پێم وت:

– من ئێوەم زۆر خۆشویست، هەرگیز لەبیرم ناچن، بەئاگا هاتم...

ئاه خۆزگە ئەمە خەون نەبوایە... خۆزگە ئەمانەم ڕووبەڕوو پێی بوتایە، بیزانیایە کە چەندەم خۆش دەوێت، ڕەنگیشە لێم تێ بگەیشتایە، بیکردمایە بە دڵخۆشترین کەسی دنیا.

## باشترین نموونەی موسوڵمان:

ئەو ڕۆژەی لەنەخۆشخانە دەرچووم هاوڕێیەکم لەگەڵ هاوسەرەکەی هاتنە سەردانم، باوکی ئەویش بازرگانێکی دەوڵەمەند بوو هاوسەرەکەشی گەنجێکی شارەزا بوو کە لەلای باوکی کاری دەکرد. کاتێك بەسەرهاتەکەم و هەواڵی سوتانی بەشە ناوخۆییەکەمانیان بیست، هاوسەرەکەی (ئێرمان) یەکسەر پرسیاری کرد:

- بەڕاست ئێوە باس لەشاری (....) دەکەن کە تیایدا بوون؟

- وتم: بەڵێ

- ئای خوایە، سەیری ئەو ڕووداوە بکەن، ئەو مستەفایەی تۆ باست کرد، چەند لەمستەفای هاوڕێی من دەچێت. زۆر سەرم سوڕما لەوکاتەدا.

- تکا دەکەم باسی بکەن ئەو هاوڕێیەتان کێیە! کە ئێرمان کەوتە باس کردنی ئیتر خۆم پێ ڕانەدەگیرا بەبێ ئەوەی بەسەر خۆم دا زاڵ ببم هاوارم کرد:

- شتی وانابێت! ئێوەش باسی هەمان کەس دەکەن. بەڵێ ئەوە ڕێك خۆیەتی.... ئێرمانیش زۆر سەرسام بوو بوو:

- بامنیش باسێکی ئەو مستەفایەت بۆ بکەم. ئەو مرۆڤە لەژیانیدا دوو یاسای بنەڕەتی بۆ خۆی هەیە، یەکێکیان: ژیان وەکو موسوڵمانێکی نمونەیی، دووەمیان: بوون بەکەسی کەسانی بێ چارەو غەریب و، دەستگیرۆیی لێقەوماوان. ژیان و تەمەنی بەمجۆرە پلان ڕێژی کردووەو نەخشەی ڕێگەشی هەر لەسەر ئەمانە دارشتووە.

ئەو سومبولی حەق دۆستی و پاکی و غیرەتە، موسوڵمانێکە کە تەنها بەوتەکانی نا، بەڵکو بەهەڵسوکەوت و ڕەوشتەکانیشی وانە دەداتە کەسانی تر، یەك خولەکیش کاتی بەخۆرایی بەفیرۆ نادات بەردەوام لەبەرەوپێش چوندایە. جگە لەوەی بەردەوام لەپەیوەندی باشدایە لەگەڵ دۆستەکانی و ئامادەی هەموو بەخشینێکە بەهەر یەکێکیان کە لە پێویستیدا بن.

لەتەمەنی دەساڵیدا قورئانی لەبەر کردووەو لەپانزە ساڵیدا بەتەواوی عەرەبی فێر بووە، دوای ئەوەی قوتابخانەی ئیمام خاتیب تەواو دەکات دەچێتە ڤیەننا لەسەر تواناو لێهاتوویی خۆی لەگەڵ فێر بوونی ڕووسی و ئینگلیزی و ئەڵمانیدا خوێندنەکەی تەواو دەکات، ئامانجیشی لەفێر بوونی ئەو زمانانە تەنها بۆ گەیاندنی زانستەکەی و تێگەیاندنی خەڵکانە لەمەسەلەکانی ئیسلام و قورئان، هیچ کاتێکیش بەئارەقی ناوچاوانی نەبوویێت یەك دینار پارەی لەکەس قبوڵ

نەکردووە. تا ئـەم خوێندنـەی ئێستاشـی بەشـەوانە کـاری کـردووە و بەڕۆژ خوێندوویـەتی، دایکیشـی لەهـەوڵی پێگەیانـدنی ئـەودا لەسـەر گەورەترین ئازار دانی بەخۆیدا گرتـووە، بـەم جـۆرە ئـەم دوو کەسـە گەورەیە پێکەوە ژیان دەگوزەرێنن.

## ئەو یادەوەریەی مامۆستا سـەعیدی نوورسـی کـە کار لە مستەفا دەکات:

گـەورەترین خـەیاڵی مسـتەفا ڕۆیشـتنە بـۆ ڕووسـیا بـۆ گەیانـدنی ئیسلام و قورئان بە خەڵکی ئەوێ.. ئەمەش لەدوای کاریگەر بوونی بە یادەوەرییەکی مامۆستا سەعیدی نوورسی لەخەیاڵیدا دروست بوو.

زیاتر خۆمم پێ ڕانەگیرا هاتمە قسە:

– چ یادەوەرییەکە تکا دەکەم؟ بۆ تۆی باس کردووە؟

– بەڵێ

– باسی بکـە تکایـە، دڵنیـام شـتێك مسـتەفای پـێ کاریگـەر بووبێـت لەسەر ئێمە زیاتر کاریگەری دادەنێت.

– ئەو یادگاریە بەم جۆرە بوو:

زانای نوێخوازو پێشەنگ بەدیعوززەمان سـەعیدی نوورسـی کـە لـە ئەستەنبوڵەوە دەچێتە وان، بە هاوڕێیەتی دوو قوتابی خـۆی پێکـەوە دەچـنە "تـیفلس" کـە بـەناوبانگترین شـارە لـە وڵاتـی گورجسـتانی ئێستا، تیفلس لەوکاتەدا شارێکی دیاری دەوڵەتی ڕووسـی بـووە، لـەو

مێژووەدا تیفلس شارێکی ناودار بووە کە موسوڵمانە تورکەکان تیایدا لەژێر دەسەڵاتی سیاسەتی پەیڕەوکراوی دەوڵەتی ڕووسیدا بوون، سەعیدی نوورسی لە زەردەخۆری عەسرێکی درەنگ وەختدا لە تیفلس، کاتێك لەسەر گردۆلکەی "شێخ سانان"ەوە لەسروشت و دەوروبەر دەڕوانێت، سەربازێك دێتە لای لێی دەپرسێت:

– بۆچی بەم جۆرە بەسەرنجەوە لەم دەوروبەرە دەڕوانیت؟ سەعیدی نوورسیش بەدانایی و باوەڕبەخۆبوونەوە:

– پلانی قوتابخانەکەم دادەڕێژم، سەربازی سەر سوڕماو یەکسەر بە گاڵتە جاڕیەکەوە دەپرسێت:

– تۆ خەڵکی کوێیت؟

– من بەدلیسیم

– باشە کەواتە ئێرە تیفلسە تۆ بەهەڵە خەیاڵ دەکەیت، سەعیدی نوورسی بە نیگایەکی کاریگەرەوە لەسەربازەکە دەڕوانێت:

– تۆ نازانیت تیفلس و بەدلیس بران! سەربازەکە بەم وەڵامە زیاتر ڕادەمێنێت:

– ئەمە مانای چییە؟

سەعیدی نوورسی بەو هەستە بەهێزەیەوە هەندێ زانیاری سەبارەت بە داهاتوو دەداتێ و دەڵێ:

– لەئاسیا و جیهانی ئیسلامیدا، سێ نوور وردە وردە بەدوای یەکدا دەست بە درەوشانەوە دەکەن، لەنێوەشدا سێ تاریکی یەك لەدوایەك

دەردەکەوێت، ئەم ڕژێمە سەپێنراو و دەسەڵاتدارەی ئێوە دەڕوخێت و، منیش دێم و لێرە قوتابخانەکەم بنیات دەنێم.

ئەوەی کە سەعیدی نوورسی لەساڵی (١٩١٠) دا وتی ئێستا ڕاستی و دروستیەکەی زۆر ڕوون و ئاشکرا دەبینرێت، ئەو ڕژێمە کۆمۆنیستەی لەساڵی(١٩١٧) لە ڕووسیا دامەزرا بەدەسەڵاتێکی زاڵم و دوور لە مرۆڤایەتی لەو کۆمەڵگایەدا سەردەمێکی تاریکستانی خوڵقاند بوو، بەجۆرێك ملیۆنان کەس بوونە قوربانی ئەو ڕژێمە سەپێنراوە، بەڕووخانی کۆمۆنیستەکان لەساڵی ١٩٩٠ دا شاری "تیفلس"یش بەسەربەستی خۆی گەیشت، لەدوای ئەمەش قوتابیەکانی سەعیدی نوورسی دێنە تیفلس و لە پێناو خزمەتکردندا قوتابخانە خەیاڵیەکەی ئەو مرۆڤە گەورەیە دروستدەکەن.

هەرچەندە لەو مێژووەدا سەربازە ڕووسەکە لەبەرامبەر ئەو کەشبینیەی سەعیدی نوورسیدا بەتوندی ڕاوەستا:

– ئای ! سەرم سوڕدەمێنێ لەم ئومێدەواریەت. سەعیدی نوورسیش لەوەلامدا:

– منیش لە ئەقڵی تۆ سەرم سوڕدەمێنێت! دەتوانیت دڵنیابیت لە ئەگەری بەردەوام بوونی ئەم زستانە؟! هەر زستانێك بەهارێکی بەدوا دێت، هەر شەوێکیش ڕۆژێك ڕووناکی دەکاتەوە. سەربازە ڕووسەکە تا دەهات زیاتر سەرسام دەبوو:

– ئەفەندی تۆ چی دەڵێیت؟ ئیسلام پارچە پارچە بووە. سەعیدی نوورسی وەڵامێکی دایەوە کە تائێستاش خوێنەران سەرسام دەکات:

– نەخێر، موسوڵمانەکان سەرقاڵی خوێندن و فێر بوونن ئەوەتا هندستان منداڵێکی بەتوانای ئیسلامە، ئینگلیز لەئامادەییدا دەخوێنێت، میسر رۆڵەیەکی زیرەکی ئیسلامە، ئینگلیز لە کۆلێژی سیاسەت وانە وەردەگرێت، تورکستان و قەوقاس دوو کوڕی قارەمانی ئیسلامن، ڕوسیاش لە قوتابخانەی جەنگ دا خەریکی خوێندنە، ئای لەو کاتەی ئەم ڕۆڵە بەجەرگانە بڕوانامەی دبلۆمەکانیان وەردەگرن و هەریەکەیان دەچنە لوتکەی سەرکەوتنی قاڕەکانیان، ئاڵای بەڕەونەق و دادپەروەری ئیسلامی باوکیان دەشەکێننەوە، لەبەر چاوی قەدەرداو بەپێچەوانەی پێشبینی خەڵکەوە، ڕاستەقینە شاراوەکان دەخەنە ڕوو.

چەندە سەرسوڕهێنەرە، لەو کاتانەدا هندستان و میسر لەژێر دەستی ئیستیعماری ئینگلیزەکاندا دەشێلران، وڵاتەکانی قەوقاس و تورکستان کە بەتورکەکانی ناوەڕاستی ئاسیا ناسراون لەژێر دەسەڵاتی زاڵم و بەزۆر سەپێنراوی ڕووسدا دەیانناڵاند، ئەمڕۆ دانە دانەی ئەو مژدانەی سەعیدی نوورسی دەیفەرموون هاتنە دی.

میسر لە ١٩٣٧دا سەربەخۆیی ڕاگەیاند.

پاکستان لە ١٩٤٧دا بەجیابوونەوەی لە هندستان بووە دەوڵەتێکی ئیسلامی سەربەخۆ، لە ١٩٩٠دا بەهەڵوەشاندنەوەی

یەکێتی سۆڤیەت، قەوقاس و کۆماری تورکستان یەك یەك بەئازادی خۆیان گەیشتن.

هەربۆیە مستەفا کە باپیرەی خەڵکی قەوقاسە، بیرۆکەی ئەوەی بۆ هات بچێتە ڕوسیاو بۆ گەیاندنی ئیسلام و نیشاندانی ڕێگەی ڕاست بەو گەنجانەی لە بۆشایی بێ ئیمانیدا ماونەتەوەو بۆ تەداوی کردنی ئەو گەنجانە بە قورئان و چارەسەرە مەعنەوییەکانی یارمەتی ئەو کەسانە بدات کە شەویان خستووەتە سەر ڕۆژ و کاردەکەن. ئەمەش وەك بەندەیەك بە ئەرکی سەرشانی دەزانێت.

منیش لە ڤیەننا لەگەڵ مستەفا ئاشنابووم، یەکێکە لەو گەنجانەی لە ژیانمدا زۆرترین متمانەو باوەڕم پێی هەبێت، چوار ساڵ لەنزیك یەك ژیاین هەرگیز لەپاکی و سادەیی و مرۆڤ دۆستی ئەو تێر نەبووم.

## زیاتر لەبەرچاوم گەورە بووبوو:

لەوە زیاتر بەرگەم نەگرت و هەڵم دایە:

- چی دەبێت، مادام لەگەڵ ئەو هاوڕێیت، تکا دەکەم یارمەتیم بدە.

- چۆن یارمەتیەکت دەوێت؟

- پەیوەندی بەمستەفاوە بکە بەجۆرێك ئێمە پێکەوە کۆبکەرەوە دەمەوێ تێی بگەیەنم کە هەرگیز لەبیری ناکەم و ئەو تاکە کەسە بەم ڕاددەیە خۆشم بوێت! چی دەبێت ئەم چاکەیەم لەگەڵ بکە، ئەمە

بکەیت وەك ئەوەیە هەموو دنیات بەخشی بێت... تکایە... ئێرهان بەبێ ئومێدیەکەوە سەری ڕاوەشاند:

- تۆ ئەو ناناسیت، چاوی ئەو کچ و ئافرەت نابینێت، هەرگیز خۆی بەو عەشقە درۆینانەوە سەرقاڵ ناکات. ئەو ئەم جۆرە شتانە تەنها بە کوشتنی کات و لەدەست دانی کەسایەتی دەزانێت، هیچ ئارەزووی بۆ ئەمانە نیە.

ئەو خۆی بۆ قورئان و ئیمان تەرخان کردووە، دەیەوێت ژیانی بە ناساندنی جوانیەکانی قورئان و ئیمان بەجیهان بەسەر بەرێت، نەك تۆ، هەموو جوانیەکانی دنیا لەدوای یەك بوەستن ئاوڕیان لێ ناداتەوە، چونکە ئامانجی ئەو ژیانە بۆ خوا، بڕوا بەمن بکەو بەر لەدەست پێکردن واز لەم خەیاڵەت بهێنە، ئەو لەبیرکە، ئەم ڕێگەیەت کۆلانێکی بنبەستە.

- بەڵام خۆ ئەو دژی هاوسەرگیری نییە؟!

- ئەو قارەمانێکە لەپێناو بانگەوازێکدا. کە کاتی هات بێگومان هاوسەرگیری دەکات، بەڵام ئێستا نا.... قسەکەم پێ بڕی:

- نەخێر بەهەڵەدا چوویت... بەدڵنیاییەوە پەیوەندی پێوە دەکەم. ئاگرو عەشق و حەسرەتەکەی ناخمی بۆ باس دەکەم بەڵکو بەهاوسەرگیری قایلی بکەم.

ئێرهان زەردەخەنەیەکی تاڵی کرد:

- بەم حاڵەتەوە نەك هەر پەسەندت ناکات، بەڵکو قسەشت لەگەڵ ناکات!

- ئەمە ئاسانە، ئەو چۆن بیەوێت وادەبم، خۆم دادەپۆشم دەست بەنوێژو بەندایەتیەکانم دەکەم.

- چاوەڕێ دەکەیت بەمە باوەڕ بکات؟

ئێرهان کە ئیتر لەحاڵی پەرێشان و ڕەنگیشە بەبڕوای ئەو بە گاڵتەجاڕی لە من تێگەیشت ئیتر بێ دەنگی لە باسەکە کرد.

بەڵێ بەهۆی هەستەکانمەوە خەریك بوو وەك منداڵم لێ دەهاتەوە، خەریك بووم قسەی منالانەو بێ مانام دەکرد، من لەکوێ و دنیای بێگەردی دروستی ئەوان لەکوێ کە بچمە ناوی!؟ بەلام ئاگرەکەی ناخم یاساکانی (مەنتق)ی نەدەزانی هەستەکان مەنتق ناناسن!

لەلایەك پێداگیری باوکم بۆ ڕۆیشتنە دەرەوەم بۆ خوێندن و لەلایەکیش عەشقی مستەفا کەبەخوێنمدا هاتوو چۆی دەکرد.

لەنێوان هەردووکیاندا بێ چارە دەتلامەوە وەکو دوا دەرفەت دووبارە لە ئێرهان پاڕامەوە.

- کەوایە تەنها ژمارەی تەلەفونی مستەفام پێ بدە دەمەوێ قسەی لەگەڵ بکەم

- تەلـەفونی تایبـەتی نییـە، بـەڵام ژمـارەی شـوێنی دانیشـتنەکانی مزگەوتیم هەیە، پەیوەندی بەئەوێوە بکـەیت ڕەنگـە بتوانیـت قسـەی لەگەڵ بکەیت.

یەکسەر ژمارەکەیم نووسی، نەك نووسیم بەڵکو دانـە دانـە لەبـەرم کـرد، ئـیتر نیـازم نـەبوو کـات بـەفیڕۆ بـدەم، بەئومێـدو پەرۆشـیەکی زۆرەوە تـاوم دایـە تەلەفونەکـەو ژمارەکـەم وەرگـرت، پرسـیاری مستەفام کرد لەو پیاوەی کە وەڵامی دایەوە، بەڵام ئەوەی کە بیسـتم بەتەواوی پەرێشان و دڵتەنگی کردم:

- کچـەکەم مامۆسـتا مسـتەفا مـاوەی دە ڕۆژە لەشـاری ئەنقەرەیـە، دایکـی تووشـی شـەلەل بـووە، لەگـەڵ ئـەو دەمێنێتـەوە لـەبارێکی قورسدان.

جگـە لـەوەی بـێ ئومێـدی دایپۆشـیم، ناڕەحـەتی و هـەزار بـیری ناخۆش بەمێشکمدا هـات و دڵـم بـەو هەواڵـە داچڵەکی بەرامبـەر ئـەو خۆشەویستیەم بۆ پوورە فاطمە، ئەو هەواڵە وەکو زەنگێکی ترسـناك دای لەدەروونم، دۆستایەتی لـەم وەختانـەدا دەردەکەوێت. بەرامبـەر ئەو یارمەتیەی ئەوان کە لەو کاتە قورسـەدا بەهانامـەوە هـاتن، ئەمـە دەرفەتێك بوو بۆ قەرەبوو کردنەوە، بەڵام چۆن و لەکوێوە دەست پێ بکەم بۆ ئەمە کەوتمـە بیرکردنـەوە . ئەگـەرەکان مێشـکمیان سـەرەو ژوور کردبوو.

هەم بۆ ڕزگار بوون لە فشارەکانی باوکم، هەمیش بۆ یارمەتی دانی ئەو دوو دۆستە قەدر شناسە، پلانێکی تازەم دانا، بەهۆی ئەمەوە ڕەنگە بمتوانیایە کەمێك نزیکییش لەگەڵ مستەفا دروست بکەم.

باروودۆخەکەم بۆ باوکم باس کردو بۆ ڕازی کردنی ئەو وتم:

– بابە گیان من ئەگەر لەم ناڕەحەتیەدا بچم بەهانای ئەو دوو کەسەوە، ڕەنگە دوایی تۆش مستەفا بەدەست بهێنێت و لەکۆمپانیاکەت بۆ کارکردن بانگی بکەیت، ئیتر لەزانیاری و ئەزموونەکانی ئەو زۆر سودمەند دەبیت، باوکم کە بۆ بەدەست هێنانی دینارێك ئەوەی لەدەستی بهاتایە دەیکرد، بێگومان بۆ ئەمە نەیوت " نەخێر".

# بەشی دووەم

## لەناو ڕووداوە پڕ نهێنیەکاندا ونبووبووم



### گەشتی ژیانم :

بەبێ هیچ کات بەفیڕۆدانێك، لەگەڵ شۆفێرە تایبەتیەکەم ڕێگەی ئەنقەرەمان گرتەبەر، کاتێك بەرەو ئەو نەخۆشخانەیە دەڕۆیشتین کە پوورە فاطمەی لێکەوتبوو، لە مێشکمدا بەهانەو قسەکانم ڕێکدەخست کە دەمویست بەجوانترین شێوە دەرکەون. نەدەبوو ئەوان ئاگاداری ئەم پلانەم بن، ئەگەر نا ئەو دوو کەسە خاوەن ڕێزە بەبێ وەستان هەموو داواکاری و یارمەتیەکانیان ڕەت دەکردمەوە، بەڕاستی لەبەرامبەر خۆشەویستی و گرنگی ئەواندا، هەموو شتێکم فیدا دەکرد، کە بەرەو نەخۆشخانەکە هەنگاوم دەنا، هەستێکی سەیر هەموو گیانمی داگیرکردبوو کە تا ئەو ڕۆژە شتی وەهام بەسەر نەهاتبوو.

خوایە ئەمە چ حاڵێك بوو؟ تەنانەت بۆ هەناسەدانیش فشارم دەخستە سەرخۆم! هێندە ئەژنۆکانم لاوازبووبوون خەریك بوو لە ناوەڕاستی ڕاڕەوەکەدا بکەومە سەر زەوی، ئەم پرسیارە هەر لەمێشکمدا دەسوڕایەوە: مستەفا چۆن ڕوو بەڕووم دەبێتەوە؟!

دەرم دەکات؟ یان بەقورسترین جنێوو قسەی ناخۆش تۆڵەم لێ دەکاتەوە؟ یاخود دەرگاکە بەسەرمدا دادەخاتەوەو بۆ هەمیشە دیوارێك لەنێوانماندا دروست دەکات؟! هەرچۆنێك بێت.... ئامادەی هەموو شتێك بووم، بۆ ئەو خۆشەویستیەی دڵمی پارچە پارچە کردبوو، ئەو سۆزەی گوێی بەهیچ نەدەدا قایل بووم بەهەر دەرئەنجامێك، تەنانەت بیستنی چەند وشەیەك لە ئەو بۆ من هەموو دنیا بوو، بەو هەزار پرسیارە بێ وەڵامەی مێشکمی کردبوو بە ڕێڕەوێکی دەرنەچوو، دۆشداماو بە ڕاڕەوەکەدا دەڕۆیشتم، ئای خوایە گیان! لەژێر فشارو دڵە کوتێیەکدا بووم دەتوت ئێستا دەبووریمەوەو ڕاست نابمەوە.

– ئیلکای... ئیلکای

ئاوڕم بۆ دواوە دایەوە کێ ببینم؟ هاوڕێکەم " ئەمەل" کە لەمنداڵیدا لە فەرەنسا پێکەوە بووین، باوەشمان کرد بەیەکدا... دوو ساڵ بوو یەکمان نەدی بوو.

– چیتە ئەوە! خێرە! حاڵت لەباش ناچێت... نەخۆشیت گیانیشت دەلەرزێت، هیوادارم هیچی خراپ نەبێت؟!

– ناسراوێکم زۆر نەخۆشە، کەمێك پەرۆشی ئەوەم.

– ناسراو؟

– بەڵێ

بەگومانێکەوە:

– هممم ....نەکا ! ؟

منیش وتم :

– نەخێر ئەمە شتێکی جیاوازە. ئەی تۆ لێرە چی دەکەیت؟

– من لێرە کار دەکەم.

– کەوتیتە ئێرەوە؟

– بەڵێ... لەبەشی فریاکەوتنم، هەروەها خۆم بۆ تاقیکردنەوەی پسپۆڕی پزیشکی ئامادە دەکەم.

قۆڵی گرتم:

– وەرە دەی .... یارمەتیت دەدەم تا هاوڕێکەت بدۆزیتەوە لەبەر ئەوەی ئەمەل یەکێك بوو هەر زوو ناخی مرۆڤی دەخوێندەوە هەر بۆیە بۆ ڕزگار بوون لەدەستی چیم نەکرد ! تا وازی لێ هێنام

## دڵم خەریك بوو دەوەستا:

شوێنی پوورە فاطمەم دۆزیەوەو بەپرسیار کردن لە پەرستارێك ژووری خەوتنەکەیم زانی، لەدەرگام دا:

– کێی لێیە؟

- من لێرەم (دەنگی کوڕێك).

- دووبارە هەموو گیانم کەوتەوە لەرزین و ئارەقێکی ساردم دەردا.

" خودایە چی دەبێت، لێت دەپاڕێمەوە... با بەر لەوەی شتێکی خراپ ڕوو بدات لێرە بڕۆم، ئەگەر خەیاڵەکانم بڕوخێن ئەم ژیانە بۆ من دەبێتە زیندان، تۆ ئەو بەندەیەت بەو هەموو پاکی و بێگەردیە دروست کردووە، منیش وابەستەی بووم، چی بکەم؟ تۆ خوڵقاندوتەو منیش خۆشم ویست، چی دەبێت یارمەتیم بدە".

بەزۆر هەنگاوەکانم هەڵدەنا .. لەناڕەحەتی و پەرۆشیمدا قۆڵ و قاچم جگە لەلەرزین جوڵەیان پێ نەدەکرا.

ئەی حاڵی دڵم بۆ ناڵێیت! خەریك بوو دەوەستا. کەمێك غیرەت.. کەمێك بەرگە گرتن.. لەبەر دەرگاکە مابووم هێشتا ئارەقەکانم دەسڕی و لەناکاو لەو دنیا تاریکەمدا مستەفام لە پێشی خۆمدا بینی... من کە لەبەر خەجاڵەتی ڕووم نەبوو تەماشای بکەم و ئەویش لەبەر ئەدەب و ڕێزداری خۆی سەری دووبارە بۆ زەوی شۆڕ کرد، بەبێ ئەوەی هیچ بڵێت ڕێگەی بەرەو لای پوورە فاطمە نیشاندام، ئەمەش ماناکەی زۆر ڕوون بوو:

" هیچ ئیشێکت لەگەڵ من نیە، چی بە دایکم دەڵێیت بیڵێ، دواییش ئەوە دەرگاکەیە دەتوانیت بڕۆیت".

بەو هەستانەوە کە خەریك بوو شاخیان لێ دەردەکردم، هەر جۆرێك بوو هەنگاوم بەرەو ژوورەوە دەنا. پوورە فاطمە بەبێ دەنگی

لەجێگەیەکدا کەوتبوو، بەتەواوی مردوویەکی دەهێنایەوە یاد، ڕوویەکی ساردو گۆناکانی سپی هەڵگەڕاو، دەوروبەری چاوەکانیشی مۆر بوو بوون.... لەژێر چنگی نەخۆشیەکی سەختدا خەریکبوو دوایین هەناسەکانی دەدا. چوومە تەنیشتی چاوەکانی داخستبوو، لێوەکانیشی قلیشا بوون، دەستیم توند گرت هەستی بەهیچ نەکرد بەڵام لەبەرخۆیەوە شتێکی دەخوێند، بۆ ئەوەی یەك وشە لە مستەفا ببیستم سەیرێکیم کردو لێم پرسی:

- حاڵی چۆنە؟

ئەویش بێ ئەوەی ڕووم تێبکات وتی:

- باشە.

- دەتوانێت هەستێت؟

- نەخێر.

- هیچ قسە دەکات؟

- زۆر کەم.

- دیارە هیچیش ناخوات!

- بەڵێ.

- چەند ڕۆژ دەبێت لێرەن؟

- یانزە ڕۆژە.

- نەخۆشیەکەی چیە؟

- جەڵتەی دەماغ.

دەتگوت بەزۆر ئەو وشانە لە دەمی دێنەدەر، تا من بۆ قسەکردن دێڕەکانم درێژتر بکردایەتەوە، ئەو بە کورتترین وەڵام خۆی لەدەستم ڕزگار دەکرد، بەڵام پیاوەتی و دروستی و مەردایەتی تەنانەت لە دەنگیشیدا هەستی پێ دەکرا، ئەوەندە کاریگەر بوو لەسەرم، دڵم تەپ تەپ بەخێرایی کەوتبووە لێدان.

## خودایە چی دەبێت من لە چارەی ئەو بنووسە:

لەناخمدا هەزاران جار دەپاڕامەوە لەخوا "ئەی خوایە گیان، ئەو کەسەی من بۆی دەگەڕێم ئەمەیە، چی دەبێت من لەچارەی ئەو بنووسە"! بۆ خاڵی کردنەوەی ئەو هەموو ئازارەی دەروونم، لەتەنیشت پوورە فاطمەوە دانیشتم، ئەو سیما نوورینەی لەناو بەرگە سپیەکەی بەریدا، مرۆڤی دەبردە جیهانێکی تر، تا تەماشات بکردایە ئارامیەکی بێ ئەندازەی دەبەخشی، جوانی دڵ و دەروونی بەتەواوی لە ڕووخساریدا ڕەنگی دابوەوە. ئەم ژنە گەورەیە تەنانەت نەخۆش کەوتنەکەشی جیاواز بوو، مرۆڤ لەکاتی نەخۆش کەوتندا ڕەنگی دەپەڕێت، کەچی ئەم زیاتر لە سیمایەکی شیرین و نورانیدا دەردەکەوت، دووبارە ڕوومکردەوە مستەفا:

– بڵێیت قسەم لەگەڵ بکات! لانی کەم ببینێت کە هاتووم، من قەرزێکی ئەوم لایە کە ناتوانرێت بدرێتەوە.

– بەبێ ئەوەی سەیر بکات:

- بپرسن ئەگەر گوێی لێتان بێت وەڵام دەداتەوە، درێژترین ڕستە لە مستەفا بیستم ئەمە بوو بەمەش خۆشحاڵ و ئومێدەوار بووم.

چەند جارێك بانگم کرد:

- پوورە فاطمە .... پوورە فاطمە، هیچ وەڵامی نەبوو، بەڵام چرپە چرپێکم لە لێوەکانیەوە دەبیستم و تێنەدەگەیشتم.

- سەیرکە لەگەڵ خۆی قسە دەکات، دیارە دەیەوێت شتێك بڵێت.

مستەفاش وتی:

- نەخێر، ئەو نزایانە دووبارە دەکاتەوە کە هەموو ڕۆژێك دەیانکات، لەحاڵێکدا من بە بەهانەی جیاواز خۆم زیاتر خەریك دەکرد بۆ مانەوەی لە ژوورەکەدا، بەڵام مستەفا بەهەموو ڕەفتارێکی نیشانی دەدا کە لێم بێزارە.

یان بەڕاستی هیچ گرنگیم پێ نادات، یان بەگوناحی دەزانێت لەگەڵ کچێکی کەم ئیماندا قسە لەو باسانە بکات، یاخود بەهۆی ئەو شتانەی پێشتر ڕوویاندا دەیەوێت خۆی زویر نیشان بدات، هەر چیەك بێت، ئەوە زۆر ڕوون بوو کە ئەو بەهەبوونی من نائارام بوو، لەگەڵ ئەوەی زۆر باش ئەمەم دەزانی بەڵام پێداگریم لەسەر مانەوەم دەکرد.

ماوەیەك خۆم بە تەماشاکردنی دنیا ئەفسوناویەکەی پوورە فاطمە و، پەند لێوەرگرتنی خەریك کرد. مستەفا واتێگەیشتبوو من نیەتی هەستان و چوونە دەرەوەم نییە، وتی:

– لەسەر ئیزنتان من دەبێت قسە لەگەڵ پزیشکەکەی بکەم، کاتێك بەرەو دەرگاکە دەڕۆیشت، هەموو توانای خۆم کۆکردەوەو، بۆ وەستانی ئەو:

– یەك خولەك، منیش ئیتر نامێنمەوە، بەلام چەند شتێکم هەیە پێتانی بڵێم، دیسان گەردەلوولی ناخم هەڵی کردەوەو هەموو لاشەم لەرزین و ترس و دوو دڵی داگیری کرد، لەناڕەحەتی ئەوەدا بووم کە چۆن و لەکوێوە دەست پێ بکەم!

ئەگەر خۆشەویستی خۆمم بۆ ئەو نیشان بدایە ئاسایی دەبوو؟ نەخێر... زۆر زوو بوو، ئەی ئەگەر ئیتر نەیبینمەوە؟ بەڵێ ئەمەش هەبوو... بەحاڵێکی پەرێشانەوە یەك دوو جار هەوڵی قسەکردنم دا بەلام وشەکانم قوت دایەوە.

لەکۆتاییدا بەهەموو غیرەتمەوە توانیم بڵێم:

– مستەفا... من زۆر ناڕەحەتم، زۆر خەمبارم، ئەو بێ ڕێزییەی بە ئێوە کرا هیچ ناتوانم فەرامۆشی بکەم، ئەم هەموو ماوەیە بەخەفەتی ئەوەوە خۆمم خواردوەتەوە، داوای لێبوردن لەتۆش و پوورە فاطمەش دەکەم.

ئەو کەسانەی تەنها بەچاویلکەی بەرژەوەندی و پارە پەرستی تەماشا دەکەن، ناتوانن شتەکانی تر ببینن، ئەوانەی کە لە منەتی چاکەو یارمەتی دان تێناگەن و بە فەلسەفەی بەرژەوەندی گۆش کراون، زۆر بەژیان و دنیای ئێوە نامۆن و منیش بێ گومان لەو

کەشەدا گەورە بووم، بەڵام من هەردوو دیوی ژیانم بینیوەو بەم دروستیەی ئێوە سەرسام بووم.

– مستەفا دەستی درێژ کرد بۆ دەرگاکە بەو مانایەی کە ئیتر نایەوێت گوێ بگرێت:

– هاتنەکەتان بەدایکم دەڵێم ئاسوودە بن، هەم من هەم دایکم ئێوەمان بەخشیوە، من ئێستا دەبێت بچمە لای پزیشک، بۆ هاتنەکەشتان زۆر سوپاستان دەکەم.

بۆ دواجار دیسان بانگم کرد:

– مستەفا... بە ڕوانینێکی ڕەق لێمی ڕوانی وەك ئەوەی بڵێت: "چی دەڵێیت؟ تۆ چیت دەوێت؟"، بێ گوێدانە ئەوەی کە ئەو چی دەڵێت و چۆن بیردەکاتەوە، لەسەر قسەکانم بەردەوام بووم، پێم وت:

– من مەحاڵە ئێوە لەبیر بکەم، جار جاریش دێمە سەردانتان، ئێوە کەسانی زۆر تایبەتن بۆ من.

بەوەڵامێکی زۆر زیرەکانە، ئیتر هەستەکانمی لەدەممدا وەستاند:

– دایکم ئێوەی وەك کچی خۆی خۆشویست منیش وەکو خوشکم.

## من تۆم زۆر خۆشویست:

لەو کاتەدا کە هەموو شتێك کۆتایی پێ هاتبوو، کە ئیتر نەدەبوو قسەیەکم هەبێت بۆ وتن، کە ئیتر کلیلی لە هەستەکانم داو دەنگمی بڕی، بەڵام هێشتاش من سەرسەختانە لەبەر خۆشەویستی ئەو بۆ دوا

دەرفەتیش بێت قسەم مابوو، لەوکاتەدا خوا وەك بڵێی موعجزەیەكی خولقاندو دەنگی پوورە فاطمەمان بیست.

– مستەفا...!

دەستی لە دەرگاكە بەرداو ڕایكرد بۆ لای ئەو ژنە پیرەی دایكی:

– دایە گیان... منیش وەك ئەو بەخێرایی گەڕامەوە بۆ لای پوورە فاطمە ئەمەش دووبارە دەرفەتێك بوو بۆ من.

پوورە فاطمە كە منی لەبەردەمی خۆیدا بینی، وەكو ئەوەی هیچ نەبووبێت تەكانێكی خواردو قۆڵەكانی كردەوە، بەزەردەخەنەیەكی بێ گیانەوە منی لەئامێز گرت. منیش بەو خەمباریە زۆرەی لەناخمدا زیادو زیاتری دەكرد بەگریانەوە خۆم فڕێ دایە ئامێزی، پوورە فاطمەش بە دوو ئەسرینی ڕوون كە لەچاوەكانی هاتنە خوار وەك بڵێی زۆر شتی وت... بەو كردەوانەیدا دیار بوو منی بەخشیبووە، تەنانەت لەو كاتەشدا لە خۆشەویستی نیشان دان بۆ من كەمتەرخەمیەكی نەنواند، بیرم دەكردەوە چی دەبوو ئەگەر ئەو تێگەیشتوویی و مرۆڤ دۆستی و هەستی كەس ئازار نەدان و میهرەبانیەی كە لەم جۆرە مرۆڤانەدا هەبوو، كەمێكیشی لەخێزانەكەی مندا هەبووایە، كاتێك لای ئەم كەسانە دەبووم، لەلایەك ئاسوودەییەك دایدەپۆشیم و، لەلایەكی تریش لەبەرامبەر ئەو هەموو بەڕێزی و مرۆڤ دۆستیەی ئەواندا بچوك دەبومەوەو خەمبار دەبووم.

ورده ورده تـا قـوولایی چـاوەکانم سـەرنجی دام، لەبـەر ئـەوەی قسەی نەدەکرد ئەوەی دەیویست بیلێ بە نیگاکانی دەیگەیاند ئەمـە جۆرە گفت کردنێك بوو کـە نـە وتاربێـژو نـە نووسـەر و نـە زانـایش ناتوانێـت ڕسـتەی پـێ دروسـت بکـات؛ ئـەوە تـەنها دڵ دەتـوانێ بیبیستێت.

ئـەوە تەماشـاکردنێکی ئەوەنـدە میهرەبانانـە بـوو کـە سـەرتاپای لاشەمی دەلەرزاندو بەهەموو بوونمـەوە مەسـتی دەکـردم، خـەریکبوو لەدڵەوە ناڵەم دەکرد:

ئاه خۆزگە تۆ دایکم بوویتایە، ئەو ساتە کەمە پڕ ئاسوودەییانەی کە هەموو شتێکیان لـەپێناودا دەبەخشـم بەدرێـژایی تەمـەنم تیایانـدا بوومایـەو لەتەنیشـت تـۆوە هـەموو ژیـانم لەدڵخۆشـی ڕاسـتەقینەدا بتوایەتـەوە، بمتوانیایـە وەکـو کچـی ڕاستەقینەت سـەرم بنایـە بـەو خۆشەویسـتییە دایکانەیەتـەوە.... ئـاه چـی دەبـوو؟! دەسـتەکانیم تونـد گـرت، ئەوەنـدەی کـە تـوانیم لەوشـەی جـوانی دەروونم خۆشەویسـتیم بـۆ دەربـڕی وەك ئـەوەی وشـە تێـك ئـاڵاو بەفرمێسـکەکانمی بیسـتبێت دیسـان برژانگـەکانی کرانـەوە، تـەنها وشەیەکی بچوکی ئەفسوناوی لەدەمی هاتە دەر، ئەو وشەیە منـی لـە حەسـرەتدا هەڵفڕانـد، هـات و لەگـەڵ سـۆزی گڕگرتـووی دەروونمـدا تێکەڵ بوو بۆ هەمیشە جێگەی خۆی گرت.

– کچەکەم!

ئاه خودای من! لەتەمەنمدا کەسێك بەو ڕادەیە بەگەرمی و لەناخی دڵەوە ئەو وشە پڕ ڕازو ناسکەی بەو دەربڕینە میهرەبانەی ئەو پێ نەوتبووم، وەك پاڕانەوە لە چاوەکانیم ڕوانی بەمانای" بەردەوام بە".... کچەکەم!

ئەوەندە بۆ من بەس بوو... لەناوەڕۆکی ئەم وشەیەدا چی حەشار نەدرابوو...! خۆشەویستی، میهرەبانی، نەزاکەت، ڕەنگیشە ئارەزووی بوون بە بوکی خۆی! ڕەنگیشە... ئەمە تەنها خەیاڵی من بێت، یاخود ڕەنگە ئەمە لەو دیو خەیاڵیشەوە مەحاڵ بێت... بابێت...

بۆ من ژیان لەو سات و خولەك و دیمەنەدا بەرامبەر هەموو تەمەنم بوو، بەهێواشی دەستەکانمی گوشی و دووبارە بەنیگاکانی ڕووخسارمی شانە کرد، نیگاکانی و هەست کردن بە گەرمایی دەستەکانی وەکو کارەبا لێدان کاری لە هەموو گەردیلەیەکی لاشەم کرد، من بۆچی ئەمەم لەدایکیشمدا هەست پێ نەکرد بوو! ! ئەگەر بۆ یەك ساتیش بێت، هەستێکم بۆ دروست بوو، وەکو بوکی ئەو خۆم دەبینی کە لە ئارەزووی خزمەتکردنیدا لە پێشیەوە دانیشتبووم.

بوون بە بوکی ئەو....؟

ژیانێك پێکەوە لەگەڵ پوورە فاطمەی تا ئەو پەڕی سادەیی سادەو تا ئەو دیوی میهرەبانی بەسۆز! کە مرۆڤ لێیەوە فێری مرۆڤناسی و بەخشین دەبوو..! ئەگەر لەخەیاڵیشدا بوو بێت

دەمویست لەناو ئەو کەشە بەهەشتیەی ئەو خێزانەدا بژیم....ئاه لەخەیاڵەکانم.

## ئەو ساتانەی ئەقڵم تیایدا دەفڕێ:

لەو کاتەی من پشووم دابوو لەو جیهانەی لێی تێر نەدەبووم، دەرگاکە کرایەوە منیش خۆم کۆکردەوەو چوومە کەنارێك خانمێك بوو.. مستەفاش بەبینینی ئەو کچە ڕۆیشتە دەرەوە. بەدڵنیاییەوە بەشیاوی نەزانیوە لەنێوان گفتوگۆی خانمانەی ئێمەدا لەژوورەکەدا بمێنێتەوە.

دەی هەر ئەمە بوو کە منی وێران کردبوو، ئەم ڕێزداری و ئەدەب و ڕەوشتە بەرزە لە کێدا دەبینرا؟! هاتنە ژوورەوەی ئەو خانمەو هەڵسوکەوتەکانی و وەستانی لەتەنیشت پوورە فاطمەو تێبینی کردنی جۆرێکی سەیر دەهاتە پێش چاو. وەك ئەوەی هیچ لەکۆمەڵگەدا نەژیابێت پاکی و بێگەردی و ناسکیەکەی هیچ لەکەیەکی تیا دەرنەدەکەوت.. ئەی بۆنە سەرنج ڕاکێشەکەی وەکو میسك لە ژوورەکەدا بڵاو بوەوە... خودایە بەتەواوی سەرسام بووم بەو خانمە پڕ ڕازە و ویستم لێی نزیك ببمەوە.

بەڵام بڕوام بەوە نەدەکرد کە بەچاوەکانم بینیم. خەریك بوو هۆشم لەدەست دەدا بەرامبەر ئەو دیمەنە پڕ نهێنی و ڕازەی کە لەو خانمە سەرسوڕهێنەرەدا بەدی دەکرا، مێشکم وەك دەهۆڵ دەنگی دەهات و

هەستم بەلێدانە خێراکانی دڵم دەکرد کاتێك ویستم بچمە ئەو دنیا سەیرەوەو دوا هەوڵمدا بۆ ئەوەی لەنهێنی ئەو خانمە تێ بگەم و نزیك ببمەوە، هەر لەوکاتەدا لە هۆش خۆم چووم و ئاگام لە دەوروبەرم نەما، هەر بۆیە دوای ئەوەم بەبیرنایەت، لەکەناریکدا بورابومەوە، منیان لەسەر جێگەیەکی تەنیشتی پوورە فاطمە پاڵ خستبوو. کە هاتمەوە هۆش خۆم خانمەکە ڕۆیشتبوو، مستەفاش لە پشت سەری دایکیەوە پەرۆشانە بانگی دەکرد:

– دایە! دایە! وەڵام بدەرەوە.... دایە....

ئەو خانمە ئەفسوناوییە بەو هاتنە پڕنهێنییەوە و ئەو دیمەنە سەیرەی دەرکەوتنی، پوورە فاطمەشی لەگەڵ خۆی بردبوو.

خودایە ئەمە خەون بوو! خەیاڵ بوو؟ یان ئەوانەی کە بینیم ڕاستی بوون؟! یان تەنها لەهۆش خۆچونێك بوو! سەرم خستە نێوان هەردوو دەستم، دەستم کرد بە هاوارکردن. کاتێك بیرم لەو ڕووداوو بەسەرهاتانە دەکردەوە کە لە ژوور سەری ئەو خانمە پاك و بێگەردەی لەژیانیدا جگە لە چاکە هیچی تری نەکردبوو، لەناو دنیا نهێنیەکەیدا وێڵتر دەبووم.

پەرستارو پزیشکەکان لەم کاتەدا ڕژانە ناو ژوورەکەوەو ئێمە یان ناردە دەرەوە، من نەمدەتوانی چیتر بەپێوە ڕابوەستم، لەجێگەی خۆم دانیشتم... ئاە ئەو دیمەنەی چەند خولەك پێشتر لەبەرچاومدا ڕوویدا، وەکو فیلم وەك شانۆیەك دەهاتەوە خەیاڵم هەزاران جار

دایدەچڵەکاندم، جگە لە پەنابردن بۆ خودا تاکو یارمەتیم بدات، هیچی ترم لە تواناندا نەمابوو.

مستەفا کە ئەو ناڕەحەتی و هاوار هاوارەی منی لەبەردەم دەرگاکەدا بینی، ئاگاداری کردمەوەو وتی:

- تکایە ئارام بنەوە، دەکرێت لە ئێستادا بەجێمان بهێڵن، ئەمە بەمانای "بڕۆ و ئاسوودەمان بکە!" دەهات، یان بەمانای "کاتێکی تر دەتبینمەوە"؟! هەڵبەت لەحاڵێکدا نەبووم بیرلەمانە بکەمەوە. کاتێك پوورە فاطمەیان برد، منیش بینینەکانم وەرگێڕاو چاوم لەسەر قووڵایی دیواری ژوورەکە وەکو حەپەسانێك هێشتەوە. ئەو دیمەنەی کە مرۆڤی سەراسیمە دەکرد دیسان و دیسان بەبەرچاومدا دەهاتەوە.

## لەناو ئەو دیمەنە پڕ پەندەدا ونبووبووم:

خودایە ئەوە چ ژنێکی سەیر بوو! دیمەنێکی یەکجار سەرسوڕهێنەر بوو، چۆن لەبیر دەچێتەوە؟! ئەوەندە سامناك و پڕ پەند بوو کە بۆ هەموو تەمەنم بۆ چرکەیەکیش لەبیرم ناچێتەوە. کە لەو دیمەنەدا ژیام ئیتر لەکێیەتی و بوونی خۆم تێگەیشتم و بۆچی و چۆن هاتنە دنیام و مرۆڤ دۆستی و ئەرکەکانم بۆ ڕوون بوەوە، بۆ یەکەمجار دەستم کرد بە لێپرسینەوەی کردەوەکانم و لەبەرامبەر ئەو هەموو هەڵانەم بەخەجاڵەت باریەوە نەفرەتم لەنەفسم دەکرد، ئەو ڕووداوەی کە لە ماوەی چەند خولەکێکدا ڕوویدا ناخرێتە ناو دێڕەکان

و وشەکان وەسفی ناکەن، نەمدەزانی باس کردنی ئەو نیگاو ڕوانینە سەرسوڕهێنەرانەی نێوان پوورە فاطمەو ئەو خانمە پاکیزەیەی وەکو فریشتە دەردەکەوت، باوەڕی پێدەکرێت؟! یاخود پێم دەڵێن ئەو کچە ئەقڵی لەدەستداوە! چی دەڵێن بابڵێن من دڵنیام ئەوانەی کە بینیم ڕاستەقینە بوون، بەڵام چۆن ڕاستەقینەیەك؟ ئەوە ئیتر منیش نایزانم.

ڕوونکردنەوەیەکم لەسەری پێ نادرێت، بەڵام ئەوەی لێی دڵنیام ئەوەیە کە لەم دیمەنەدا دوو کەس ڕۆڵیان بینی و منیش شاهیدیان بووم، بڵێن خەیاڵە، خەونە، خورافاتە... هەرچی بڵێن بابیڵێن.

من باوەڕم بەمە کردو بۆ من ئەو دیمەنە بەس بوو.

ئەو ساتەی منی بەخۆم ناساند، ئەقڵمی لەسنورەکان پەڕاندەوەو بەدڵ هەستم بەشتە نەزانراوەکان کرد، ئەو دیمەنە.... بائەو چەند چرکە ساتە پڕ لەپەندو حیکمەتەی لەپێش چاوم ڕوویدا باس بکەم، تاکو ئەو کەسانەی وەك من لەجیهانی ڕۆحەکان بێ ئاگان و هەموو شتەکان بەپێوەری ماددە دەپێون وانەی لێ وەربگرن.

باسی بکەم، تاکو لەمەوە دەوڵەمەندەکان هەست بەهەژاری ڕۆحیان و هەژارەکانیش هەست بە دەوڵەمەندی دەروونیان بکەن.. باسی بکەم تاکو تێ بگەن لەساتە وەختی لە ئامێزگرتنی مەرگدا ئەوەی مرۆڤ پێویستیەتی چییە!

باسی بکەم پێش هەمووان بۆ خۆم....تاکو ئەو ساتە پڕ لەپەندە کار لەمێشکم بکات و ژیانی بەگوناهە داپۆشراوم سەرلەبەر بگۆڕێت.

باسی بکەم کە لە دنیادا هیچ کەسێکم بەشێوەی ئەو خانمە نەدیبوو، کاتێك بەهاتنە ژوورەوەی هەموو شتەکان گۆڕان وەك بڵێی ملکەچ دەردەکەوتن. بەجۆرێك بۆیەی دیوارەکان، بەڕەی سەر زەویەکەو، دەرگاو پەنجەرەکان هەموو ڕەنگێکی ئەفسوناوی داپۆشین.

کە جەستەی بێ گیانی پوورە فاطمەش لەسەر جێگەکەی مێزێکی سەیری بەبەردا هات، ئەوانەی کە بەبەرچاومدا هاتن و ڕوویاندا تەنها لەیەك وشەدا کۆی دەکەمەوە" مێشکمی وەستاند" ئەی جلوبەرگی ئەو خانمە؛ من هەرگیز لەو جۆرەم لەهیچ جێیەك نەدی بوو هەموو ئەو شتانەی دەوروبەرم بەخۆشمەوە جیاوازتر دەردەکەوتن.

ئەو هەوایەی کە هەڵیشم دەمژی وەك بڵێی سیەکانمی پاك دەکردەوەو لە هەموو گوناهو پیسی و خراپیەکانم دایدەماڵیم وەك بڵێی لەژوورەکەدا کات وەستابوو، لەناو زەمەندا کاتێکی جیاواز دروستبوو بوو، لەناو دنیای فانیدا جیهانێکی باقی خولقابوو.

کە دەستم بەهێواشی درێژکرد تاکو هەست بە جلەکانی بەری بکەم، دەتوت دەوروبەرم بووە بەڕێکرو ئەو خانمەش بە پەرژینێك دەورە دراوە. دەست لێدانی مەحاڵ بوو، ئیتر ئەو بارە بەتەواوی پەرێشانی کردم.

دوایی هەوڵی خۆمم دا بۆ حاڵی بوون لەو گفتوگۆیـەی لەنێوانیانـدا هەبوو، بۆیە خۆمم درێژ کرد بۆ چونە نێوانی ئـەو دوو دۆسـتەوە هـەر ئەو کاتە بوو کە ئەمانەش ڕوویاندا.

ئـەوە حاڵێك بـوو کـە ئەوەنـدە بەسام و ئەوەنـدە پڕ پەنـد بـوو کەئەقڵەکان دەوەستێنێ و چاوەکان ئەبڵەق و زمانەکانیش بێ دەنـگ دەکات.

## خودایە، شتی ئاوا نابێت!

ئەوەی لەسەر جێگەکە پاڵ کەوتبوو پووره فاطمەی پیرو پوکـاوە نەبوو، بەڵکو شاجوانێکی هەژدە ساڵەی دنیا بـوو کـە پارچـەیەك بـوو لەمانگ، وەك بڵێی پووره فاطمـە بەهاتنـە ژوورەوەی ئـەو خانمـە پـڕ ڕازە وەکـو جـوانترین خـانمی دنیـا بێـت گەڕاوەتـەوە بـۆ سـەردەمی ناسکی کچێتی خۆی.

ئـەی پـەروەردگار ئەمـە ڕاسـتی بـوو؟! یـان خـەیاڵی مـن بـوو! نــەخێر.... نــەخێر....زۆر بەئاشــکرا لەژوورەکــەدا دەدرەوشــانەوە لەدیمــەنێکی ئێجگــار دڵڕفێندا...چــاوانێکی بەســۆز پــڕ جــوانی، سـیمایەکی درەوشـاوە بـەنوور، ئـەو وشـە ئەفسـوناویانەی دەنگیـان دەدایــەوەو لەدەمیانــەوە لەگــەڵ بــەرزترین ئــەدەب و شــەرمدا دەردەچـوون لـە ڕووخساریشـیاندا ئـەوەی بەدیـدەکرا دڵخۆشـیەکی هەمیشەیی بوو.

خودایە ئەم ئافرەتە کێیەو ئەم قسانەی بەو گەرمی و سۆزەوە لەنێوانیاندا دەکرێت چین؟!

بۆ حاڵی بوون لێی خەریك بوو خۆمم لەناو دەبرد پەرێشان مابووم هەر هیچ نەبێت وشەیەکیش تێبگەیشتمایە بۆ من بەس بوو، ڕەنگیشە لەبەر ئەو ڕاددە زۆرەی ئارەزوو کردنی دڵم بوو بێت بۆ تێگەیشتن لەبەشێکی کەمی ئەو قسانەی لەدنیای ئەواندا دەگوزەرا خوای میهرەبان کردمیە شاهید.

بەپوورە فاطمەی وت:

– چاوت ڕوون، فاطمەی خوشکم دوعاکانت وەرگیران، پەروەردگارم تۆی لەلای خۆی بەجوانترین شێوە قبوڵ کردووە، گوناهەکانیشت سڕانەوە.

پوورە فاطمە لەبەرامبەر ئەم قسانەیدا، چاوەکانی لێکناو تاڕادەی بورانەوە ڕۆچوو پاشان لەقووڵایی دەروونیەوە پاڕایەوە:

– زۆر شوکرو سوپاس پەروەردگارم واتە ئەو گوناهانەی لەسەردەمی نەفامی و سەرلێ شێواویمدا ئەنجامم دان لای خوا گیان سڕاونەتەوە!

– خوای مەزن، داوایەکی ڕاستەقینەی بەندەیەکی خۆشەویست و تێکۆشەر دەگەڕێنێتەوە؟! لێخۆش بوون و میهرەبانی ئەو زاتە (جل جلالە) ئەوەندە بێشومارە، کە ئەگەر گوناهی هەموو بەندەکانی کۆبکرێنەوە دڵۆپێك لە لێخۆش بوونی ئەویان بەسە، ئەو بەندانەی کە لەدڵەوە حەز بە نزیکی دەکەن و لەناخەوە لێی دەپاڕێنەوەو لەبەر

تـاوان و هەڵـەکانیان بەفرمێسـك ڕشـتنەوە تەوبـە دەکـەن بەدەسـتی خاڵی دەگێڕێتەوە؟!!

تۆش فریوی گەنجێتیت خواردوو هەڵەت کـرد، گوناهـت ئەنجامـدا، بـەڵام بەیارمـەتی هاوسـەرەکەت پلەیـەکی ئەوەنـدە بـەرزی ئیمانـت بردەوە کە بویتـە دایـك بـۆ چـەندەها بـێ چارەو لێقـەوماو، ئـەو نـزا ڕەتنەکراوانەی ئەوانت قبوڵ بوو، ئەو کەسەی بردیەوە ئێستا تۆیت.

ئێستا پێکەوە دەچینە گەشتێك.

– واتە من مردووم؟

– نـەخێر نـەمردوویت، چـونکە شـەهیدەکان نـامرن، ئـەوان تـەنها جێگاکانیـان دەگـۆڕن، بـە هـەنگاوێکی بـێ ناڕەحـەتی دەچـنە ئـەو دنیایەی ترەوە، هەرگیزیش ئازاری مەرگ ناچێژن.

– بەڵام خۆ من شەهید نیم....

– تۆش شەهیدی مەعنەویت، لە ئاخیر زەمانـدا کـە زۆربـەی خـەڵکی بەرەو خراپەکاری دەچن، ئەو کەسـانەی کـە گوێڕایـەڵی فەرمانـەکانی خودا دەکەن و لەپێناو ڕەزامەندی ئەو زاتەدا دەژیـن و نـووری ئیمـان ژیانیان ڕووناك دەکاتەوە دەبنە ڕابـەرو پێشـەوا بـۆ کەسـانی تـریش، ئەوانە شەهیدی مەعنەوین، بەتەواوی وەك ئەوەی لەجەنگدا لەپێناوی خوادا تێ بکۆشن، بەسڕینەوەی تاوانەکانیان و بەدەست هێنـانی ئـەو پلەیەوە دەمرن.

لەبەر ئەوە تۆش بوویتە شەهیدی مەعنەوی و لەسزاو ناڕەحەتی ناو گۆڕو حەشر ڕزگارت بوو، گوناهەکانت سڕانەوە بەڕاکردن بەرەو لای هاوسەرەکەت دەچیت کە لەبەهەشت چاوەڕێت دەکات، لەناکاو فرمێسك لەچاوانی پوورە فاطمە هاتنە خوار:

– بەم گوناهبارییەمەوە؟!

– بەتەنها پێغەمبەرەکان بەبێ گوناه دەچنە بەهەشتەوە ئەوانەش کە ئومێدیان لە خواوەند نابڕێت، ڕوودەکەنە ئەو دەپاڕێنەوە، ئەو بەندانەش دەچنە بەهەشت. ئەو خۆشی و ئومێدەی کە لەچاوانی پوورە فاطمەدا دەرکەوت پەلی کێشا بۆ سەر زمانی و کەوتە پاڕانەوە.

– پەروەردگارم! ئەم بەندە گوناهبارەت لە ئەهلی بەهەشت بنووسە، بۆ خاتری گەورەیی و شکۆمەندیت هیدایەتی هەموو موسوڵمانە گوناهبارەکانی تریش بدە.

– ئەو خانمە پڕ ڕازە دانیشتن و وەستان و تۆنی دەنگی کە بەتەواوی جیاواز بوو لە سروشتی کەسێکی دنیایی، بۆ زیاتر بەرچاوڕوونی پوورە فاطمە لەو وتە پڕ پەندانەی بەردەوام بوو:

## هەواڵێکی پڕ ڕاز:

– پیاوێك هەموو کات لە دوعاکانیدا داوای دەکرد" خودایە، کاتێك ڕۆحت لێسەندمەوە، با تەنانەت ڕۆحیشم ئاگادار نەبێت"، ڕۆژێك نەخۆش دەکەوێت کاتێك هاوسەرەکەی خواردن ئامادە دەکات لەدەرگا دەدرێت، ئەوەی لەپشت دەرگاکە دەبێت دەڵێت:" بیستم کە هاوڕێکەم نەخۆش کەوتووە، منیش هاتوومە سەردانی" پیاوە نەخۆشەکەش کە هاوڕێکەی دەبینێت زۆر دڵخۆش دەبێت، لەکاتی قسەکردنیاندا هاوڕێکەی دەڵێت: " وەرە بچین پێکەوە کەمێك بگەڕێین، باش دەبیت"، دەچنە دەرەوە پیاسەیەك دەکەن، دواتر نەخۆشەکە دەڵێت" ئیتر بابگەڕێینەوە ماڵەوە "، کاتێك دەگەڕێنەوە، بەردەمی ماڵەکەیان زۆر قەرەباڵغ دەبێت، هاوسەرەکەی و منداڵەکانی دەگرین، لەو ناوەشدا تابوتێك هەیە، پیاوەکە ئەو دیمەنە نامۆیە دەبینێت لەهاوڕێکەی دەپرسێت:

– ئەو قەرەباڵغیە چییە؟ هاوسەرو مناڵەکانم بۆچی دەگرین؟ ئەی ئەو جەنازەیە کێیە؟!

ئەویش دەڵێت:

– وەرە بچین ببینین، با ئێمەش بزانین.

کاتێك دەگەنە مەزارە تازە هەڵکەندراوەکە دەبینن کە پێغەمبەرﷺ تەلقین دەخوێنێت، خەڵکێکی زۆریش بەئارامی گوێیان بۆ گرتووە، ئەمانیش دەچنە ناو ئەو بێدەنگیەوەو گوێی بۆ دەگرن.

دوای بەسەرچوونی ماوەیەك پیاوە نەخۆشەکە ئاوڕ دەداتەوە بەلای هاوڕێکەی دا:

– ئیتر بڕۆین هاوسەرەکەم و منداڵەکانم خەمیانە، بەلام لە هاوڕێکەیەوە هیچ دەنگێك نابیستێت، سێ جار هەمان قسە دووبارە دەکاتەوەو بێ وەلام دەبێت، دوای ئەوەی چەند جاری تر دووبارەی دەکاتەوە لەکۆتاییدا هاوەڵەکەی لادەکاتەوە:

– تۆ کە دوعات دەکرد، بەردەوام داوات نەدەکرد خودایە کاتێك ڕۆحمت بردەوە تەنانەت ڕۆحیشم ئاگادار نەبێت؟!

– بەڵێ.

– دەی تۆ مردوویت، ڕۆحیشت تەنانەت پێی نەزانی. تۆ، لەبەر ئەوەی کە لە ژیاندابوویت بەردەوام بەهاواری لێقەوماو بێچارەکانەوە دەچوویت و دەبوویتە پەناو یارمەتیدەریان، نزاکانی ئەوانت بۆ گیرابوو، بۆیە بویتە شەهیدی مەعنەویی و هیچ ئازاری مەرگت نەچەشت چونکە ئەو خێرخوازانەی دەستی بێ چارەکان دەگرن گوناهیان دەسڕێتەوە، ئەگەر بەڕواڵەت گوناهکاریش بن.

لەبەر خێرو چاکەکانیان گوناهەکانیان پاك دەبێتەوەو شیاوی بەهەشت دەبن...

ئەویش دەپرسێت:

- باشە ئەی تۆ کێیت؟

دەڵێت:

- من ئیزرائیلم-

لەوکاتەدا مێشکم زرمەی لێوە هات یەکسەر چاوەکانم داخران و گوێیەکانم کپ بوون و سەرم دەخولایەوە، لەدوای ئەوەوە بەلەرزینێکی زۆرەوە کەوتمە سەر زەوی.

پوورە فاطمە چۆن باسی تۆ بکەم؟ چۆن وەسفت بکەم نازانم! دیارە کە تۆ خۆشەویستی خوداو دۆست و هاوەڵی ئیزرائیل دەرچوویت!

تۆیەک کە خاوەنی ئەو میهرەبانیە گەورەیەیت و لەکۆتا ساتەکانیشدا نزا بۆ کەسانی گوناهبار دەکەیت، خودایە چی دەبێت! یەکێك لەو بەندانەی ئەو نزای بۆ کرد بائەم بەندەیەت بێت!

هاواری ناخم ئیتر پێ ڕاگیر نەدەکرا، بەجۆرێك دەمناڵاند کە ئاگادار نەبووم هەموو ئەوانەی دەورووبەرم سەیرم دەکەن فرمێسکەکانم نەدەوەستێنران، هەستە گەرم و خرۆشاوەکانم بۆ دانەدەمرکایەوە.

لەدوای هەموو ئەو ڕووداوانە بۆ دەستپێکی ژیانێکی نوێ و بەبەرنامە، پێویستم بەنەخشە ڕێگەیەك هەبوو.. هەر ئێستا و هەر لێرە.. کاتم نەبوو یەك چرکەش بەفیڕۆ بدەم.. بەڵام ئەمەم چۆن

بکردایە؟ لەکوێوە دەستم پێ بکردایە؟ کێ یارمەتیدەرم بوایە؟ مستەفا، کە لە هەبوونیشم بێزار بوو، دونیای منی ئەوەندە دوور لە دونیای خۆی دەبینی، بڕوا ناکەم لە ئامانجی گەڕانەوەکەم تێ بگات یان نایەوێت تێ بگات.

ناحەقی بوو؟! بێگومان نەخێر...دوو دنیای زۆر جیاواز... لەلایەك مستەفا کە لەگەڵ حەرامێك تێوەنەگلاوەو خاوەنی ئەقڵ و فیکرێکی پاك و تەندروست بوو، بۆ لەکەدار نەبوونی کەسایەتی، خۆی لەناو دنیای پاکی دەروونیدا بەندکردووە، لەلایەکی تریشەوە ئیلکای ئەو کچەی کە نەفسێکی بەگوناهو تاوان پیس بوو و کەسایەتیەکی شێواو هەڵەشەی هەبوو...

ئەم دوو دنیایە چۆن پێکەوە کۆدەبونەوە؟ منێك کە بۆنی چەندین حەرامم کردوە لەگەڵ مستەفایەکی حەڵاڵخواز... چۆن دەبێت؟!

ئەمە خەیاڵ کردنیشی گەمژەیی و بێ ئەقڵی بوو..ئەگەر مستەفای خاوەن شەرم و ئەدەبی بێ ئەندازەش بۆ ئەمە داواکار بوایە نەدەبوو من پێی بڵێم:" منی خاوەن دنیایەکی تاریك بەهەڵەو تاوان شیاوی تۆ نییم؟!" من چ جۆرە مرۆڤێك بووم؟ گیانی گوناهباری خۆم لەگەڵ ڕۆحی بێگەردی ئەو چۆن پێکەوە بگونجێنم!؟

## نابێت هەرگیز نابێت:

بەڵێ ئەمە ڕاستی و واقیع و مەنتیقە، بەڵام ئاخ ئەم دڵەم فەرمان وەرناگرێت، کە ئەقڵم دەڵێت بێ دەنگ بە بێ دەنگ نابێت، ئەم عەشقە گوێکانی داخستووەو ئاگادار کردنەوەکانم قبوولٚ ناکات.

لەکاتێکدا ڕابردووم لەدەریایەك گوناهدا شەپۆلی دەدا ڕۆحم بەدوای کەسێکی فریشتە ئاسادا دەگەڕا.

خودایە تۆ یارمەتیم بدە! باشە گوناهم زۆر کردووە، بەڵام من مافی ئەوەم نیە کە پەڕەیەکی نوێ هەڵبدەمەوە؟! ڕێگەم پێ نادرێت واز لەگوناهەکانم بهێنم و هەوڵبدەم ڕزگارم بێت لێیان؟!

ئەگەر کەسێك داوای لێخۆشبوون بکات بەدڵ شکاوی دەگەڕێنرێتەوە؟! پوورە فاطمەش کە تەنانەت لەگەنجیدا گوناهی ئەنجام داوەو پەشیمان بوەتەوەو بەلێخۆشبوون شیاوی بەهەشت و شەهید بوون بوو، ئایا ئەو دەرگایە لەمنیش ناکرێتەوە؟ خودایە چی دەبێت نەخشە ڕێگەیەکم بۆ دیاری بکە.. ڕووناکیەکم پێ نیشان بدە... ڕابەرێکم بۆ ڕەوانە بکە، کەدەستم بگرێت، منیش بباتە ئەو دنیا نەبڕاوەو نێوان ئەو کەسە بەرزانە ! چی دەبێت خوایە گیان! لەگریاندا چاوەکانم سور بووبوون، حاڵێکم هەبوو کە ئەوانەی دەوروبەرم بەردەوام بەچاوێکی خەمبارو بەبەزەییەوە تەماشایان

دەکردم، تەنانەت مستەفاش کە سەرقاڵی وەفات کردنەکەی دایکی بوو، بەرگەی ئەو پەرێشانیەمی نەگرت، هاتە لام:

– ئیلکای خان لەیەکەمین جاری ڕووبەڕووبوونەوەمانەوە ئاگاداری ئەو گرنگی پێدانەی ئێوەم، لەدڵسۆزیشتان گومان ناکەم، بەڵام ئەوەی ئێوە بۆی دەگەڕێن لەمندا نیە نامەوێت لەخۆڕا خۆتان ئازار بدەن، ئێوە ئەمانەتێکی خۆشەویستی دایکمن و، منیش برای ئێوەم.

ئەمە کۆتا خاڵ بوو! یان تەنانەت ئەم قسەکردنەشی دەبووە ئومێدێکی تری بەرەو پێش چوون بۆ من! بەو حاڵە پەرێشانە ڕووخاوەمەوە لەبەردەم مستەفادا لەبەر ئەوەی کە خۆم بەپێوە پێ ڕانەدەگیرا، هەموو هاوارەکانی ناخم کۆکردەوەو بەدەنگێکی نزم توانیم بڵێم:

– من ئێوەم زۆر خۆش ویست، ئایا هاتنە بەر دەرگای ماڵی ئێوە لەوکاتەی شەودا هیچ مانایەکی ئیلاهی تیانیە؟! من گۆشت و خوێنم خۆش نەویستووە بۆچی لێم تێناگەن؟! ئێوە بەهەشتی دنیاتان پێ نیشان دام، ئێستاش دەرم دەکەن لێی، ئەمە چۆن لەویژدان و میهرەبانی ئێوە دێت!

ئەو دەربڕینانەی ناخم لە ڕووخسارمدا بەخەمێکی ئازاردەر ڕەنگی دابووەوە، کەئەمەش وایکرد مستەفا هەر چەندە چەند هەنگاوێکی بۆ دوورکەوتنەوە لەمن نابوو، بەڵام گەڕایەوە دواوە.

لەڕووخساری ئەویشدا ئازارێکی تاڵ و لە لێوەکانیدا خەم دەباری دیار بوو کە لەگەڵ خەمی دایکیدا ئەو حاڵەی منیش هەستی میهرەبانی ئەوی جوڵاندووە بۆیە وتی:

- من زۆر باش لەئێوە تێدەگەم، بەڵام ئێوە لەمن تێناگەن، ئێمە گەنجی دوو دنیای جیاوازین، هیچ خاڵێکی لێکچوونمان نییە، لەبەر ئەوە نامەوێت ئومێدەوارتان بکەم، بۆ ئەوەی گونجاو بێت ئێمە هاوسەرگیری بکەین، دەبێت تۆ ببیت بە "حیفا خاتوون" و منیش ببمە "صوهەیب" ئەگەر ئەمە گونجاو نەبێت ئەوا جگە لە دوعا کردنم بۆتان هیچ کارێکی ترم پێ ناکرێت، لەگەڵ هەموو ئەمانەشدا ئەگەر خودا ویستی لەسەر بێت ملی بۆ دەدەین ڕووی وەرگێڕاو ڕۆیشت..

لەوێدا بەتەنها مامەوە بەو وتانەی منی لەنێوان بێ ئومێدی و ئومێدەوار بووندا جێهێشت، حاڵم وەك گلۆلەیەکی خلۆر کراوەی لێهاتبوو ئەو قسانە ئەگەرێکی زۆر دووریش بوونایە دەرگایەکیان لەدڵمدا کردبووەوە، لانی کەم ئەوە تەنها هەڵسەنگاندنی من بوو بەڵام بۆ من بەس بوو.

## زۆر پەرۆشی بەسەرهاتی

## حیفا خاتوون و صوهەیب بووم

لەتەمەنمدا بۆ یەکەمین جار ئەو دوو دۆستە خۆشەویستەمم بەڕێ کرد، یەکێکیان بەرەو بەهەشت، ئەوی تریشیان بەرەو قووڵایی دەروونم، بەڵام زۆر پەرۆشی زانینی بەسەرهاتی حیفا خاتوون و صوهەیب بووم، ڕەنگە لەو چیرۆکەدا دەروازەی تازەو ئومێدی تازە بۆ من شاردرا بێتەوە، هەر دەبوو ئەو بەسەر هاتەم دەست بکەوێت لەسەرەتاوە تا کۆتایی ئاگاداری بم.

ناوی حیفاو صوهەیب لەمێشکمدا بەبەردەوام دەنگی دەدایەوە. بەم حاڵەوە لەنەخۆشخانە دەرچووم، بەبێ کات بەفیڕۆ دان خۆم گەیاندە ئەو کتێبخانە دینیەی لەوبەر شەقامەکەوە بەدیم کرد، بەشڵەژاویەکی زۆرەوە بە کتێب فرۆشەکەم وت:

– بەسەرهاتی حیفا خاتوون و صوهەیبم پێ بدەن! پیاوەکە بەبێ ئەوەی دەنگی لێوە بێت کتێبێکی بۆ هێنام.

– ئەو چیرۆکەی باست کرد لەناو ئەم کتێبەدا هەیە.

کتێبەکەم کردەوەو هەر لەوێدا خۆم لەناو پەڕەکانیدا ون کرد، ئای خودایە! ئەمە تەنها بەسەرهاتێك نیە بەڵکو بەڵگەیەکە کە خوێن لە جەستەی مرۆڤدا دەوەستێنێت. ئەقڵ لەسەردا بەهۆش دێنێتەوە، چەند نەشیاو بوو کە بەو بەسەرهاتە کاریگەر نەبیت و لەدوای

بیستنی بەخۆداچوونەوەیەك نەكەیت! ئەمە ڕووبەڕووبونەوەیەك بوو هەموو ئەو چیرۆكانەی دیكەی كە بەناوی عەشق و خۆشەویستییەوە باوەش بە گۆشت و خوێندا دەكەن ژێر پێ نا.

زۆر پێی هەستیار بووم، لەرزاندمی، لەخودا پاڕامەوە:"چی دەبێت پەروەردگارم خۆشەویستیەكی ئاواش بەمن ببەخشە.

حیفا خاتوون... دەوڵەمەندیەكەی و جوانیەكەی كە دەتوت پارچەیەكە لەمانگ، بۆتە داستانی سەر زمانەكان.. كەسی بەناوبانگ و كوڕی وەزیر نەماوە كە داخوازی لێ نەكردبێت...

كەسانێك كەدەكەونە داوی گەوهەرو پارەوەو.. كەسانێك دەبنە وێڵی بەدەست هێنانی كلیلی باخچەیەكی پڕ لەجوانی بەڵام دڵی حیفا خاتوون بە خۆشەویستی هەمیشەیی و عەشقی ئیلاهی دەسوتێت...

ڕۆژێك دەچێتە خزمەتی حەزرەتﷺ:

– ئەی پێغەمبەری خودا فێری شتێكم بكە كەدەمگەیەنێتە بەهەشت!! لەكاتێكدا ئەو چاوەڕێ دەكات پێغەمبەرﷺ بەوە ئامۆژگاری بكات " ڕۆژانە ڕۆژو بگرەو شەوانیش نوێژ ئەنجام بدە"، بەڵام پێغەمبەرﷺ پێی دەفەرموێت:

– حیفا تۆ دەبێت سەرەتا هاوسەرگیری بكەیت، بەمەش نیوەی ئیمانەكەت دەپارێزرێت! حیفاش بەملكەچییەكی زۆرەوە ڕازی دەبێت:

– ئێوە كێ بەگونجاو بزانن من پێی ڕازیم.

- پێغەمبەریشﷺ دەفەرموێت:

- سبەینێ بەیانی یەکەم کەس کێ هاتە مزگەوت لەگەڵ ئەو هاوسەرگیری بکە، حیفا خاتوونیش بەبێ دوو دڵی ئەم تەکلیفەی پەسەند دەکات هاوەڵێکی هەژارو غەریبیش بەناوی صوهەیب ، ئەم هەواڵە دەبیستێت، بەڵام هیچ سەرنجی نادات، چونکە کەی ئاسایی بووە غەریبەیەك کە ماڵ و حاڵی نەبێت و سکی بەنارەحەتی بۆ تێر بکرێت و لەژێر دارو لەناو مزگەوت ڕۆژ بکاتەوە، جێگە لەناو دڵی کەسێکی ناودار بە جوانی و دەوڵەمەندی بکاتەوە ! ؟

بەڵام تەماشای کاری خوا بکەن، ئەو بەیانیە هەریەك لە هاوەڵان بەبەهانەیەك لە چوون بۆ مزگەوت دوادەکەون، پێغەمبەری ئازیزمانﷺ یەکەمین کەس کە دەیبینێت دەچێتە مزگەوت صوهەیب دەبێت، حەزرەتیشﷺ هەر لەدوای نوێژ حیفا خاتوون بانگ دەکات و لەئەنجامەکە ئاگاداری دەکات، بەملکەچیەکی تەواو حیفا خاتوون دەنگێکی لێوە نایەت، حەزرەتﷺ لەپاش پێشکەش کردنی وتارێکی جوان نیکاحەکەیان دەخوێنێت و دواتر صوهەیبی هەژارو نەبوو لەگەڵ حیفا خاتوونێك کە پاشاو گەورەکانیش بۆ بەدەستهێنانی پێشبڕکێیان دەکرد ڕەوانەی ماڵەوە دەکات.

ئەو شەوە صوهەیب پێی دەڵێت:

- حیفا ... دەزانم تۆ بۆ من نیعمەتێکی زۆر گەورەیت، منیش بۆ تۆ بەتەنها بارێکی سەر شانم، لەبەر ئەوە من سوپاس گوزاربووینم و تۆش

ئارامگرتنــت پێویســته، دەتــەوێت ئەمشــەو بەپەرستشــەوە بەســەر بەرین! لەبەر ئەوەی ئازیزمانﷺ فەرمویەتی:

" لەبەهەشــتدا ســاباتێك هەیــە، لــەوێ تــەنها ســوپاس گــوزارو ئارامگرەكــان دادەنیشــن"، هــەر واش دەكــەن بەرماڵــەكانیان بەفرمێسكەكانیان تەڕو دڵەكانیشیان بەزیكر ڕۆشن دەكەن.

جوبرەئیل (سەلامی خوای لەسـەر بێـت) پێغەمبـەری خـوا لـەوەی ڕوویدا ئاگادار دەكاتەوە و مژدەی بەهەشتی بوونی ئـەوانی لـەخودای مەزنەوە پیێ دەگەیەنێت.

بەیانی داهاتوو پێغەمبەرﷺ لەدوای نوێژ صـوهەیب بـانگ دەكاتـە تەنیشت خۆی و پێی دەفەرمووێت:

– ئەی صوهەیب ئەو حاڵەی دوێنێ شەوتانم بـۆ بـاس دەكـەیت، یـان من باسی بكەم؟ صوهەیب سەری دادەخات و دەڵێت:

– نێردراوی خواﷺ باشتر دەزانێت.

پێغەمبەریشﷺ دەفەرمووێت:

– خۆش بەحاڵی ئێوە، هەردووكتان بەهەشتین.

صوهەیب خێرا دەچێتە سوجدەو دەپاڕێتەوە:

– پەروەردگارا.. تۆ لەمن خۆش بوویـت كەواتـە بـەر لـەوەی تووشـی گوناه ببمەوە ڕۆحم لیێ بسەنەوە!

ئەوەندە ئیمانی جۆش دەخوات، كە مـەولای مـەزن داواكـەی ڕەت ناكاتەوەو هەر لەناو سوجدەكەیدا ڕۆحی دەسپێرێت.

ئەو هاوەڵانەی لەمزگەوت دەبن بەسەرسامیەکی زۆرەوە فرمێسکی چاوەکانیان دەبارێنن بۆی.

پێغەمبـەرمانﷺ بـەو باوەڕدارانـەی لـە هەیبـەتی ئـەم ڕووداوەوە سەردەنێنە سوجدە، دەفەرمووێت:

- شتێکی لەمە سەیرترتان پـێ بڵـێم! لـەم کاتـەدا حیفـا خـاتوونیش ڕۆحی تەسلیمی حەق کرد.

مەزاری ئەو دوو عاشقی خودایە لەتەنیشت یەکەوە دروست دەکەن لەســـــەر مـــــەزاری یــــەکێکیان دەنووســــــن: (لەســــــوپاس گوزارەکان"صــوهەیب")، لەســـەر ئـــەوەی تریشـــیان دەنووســـن: (لەئارامگرەکان "حیفا") ئەوان بەدەر لە دنیای فانی و عەشقی فانی، بـــەرەو دنیــــای هەمیشـــەیی و خۆشەویســـتی هەمیشـــەیی دوور لـــە جیابوونەوە ڕۆیشتن.

وانەی زۆر گەورەم لـەم چـیرۆکەدا دەرهێنـا کـە تـا قـووڵایی نـاخم کاریگەری لەسەر دانام، زۆر باشیش لەوە گەیشتم کە بۆچـی مسـتەفا منـی ڕەت دەکـردەوە، لەوانەیـە نەبوومایەتـە حیفـا خـاتوون، بـەڵام دەمتوانی ببمە بەندەیەك کە خوام زۆر خۆش بوێت و شیاوی مسـتەفا بم، جگە لەوە شانسـێکی تریشـم نـەبوو، کـەوابێ بـۆ بردنـەوەی ئـەم تاقیکردنەوەیە بەشەوو ڕۆژ هەوڵدانم پێویست بوو، ئەگەر لەم دنیـاش نەبوایە لەخوا دەپاڕامەوە بۆ ئاخیرەتم، ئەو ڕۆژە بڕیارێکم دا کـەوەك داکوتانی بزمارێکی ژەنگاوی بوو بەمێشکمدا..

دەبێت ببمە حیفای مستەفا...لەو ساتەی کە خۆم لەنێوان دنیاو ئاخیرەتدا ون کردبوو بەزەنگی تەلەفونەکەم بەئاگا هاتم، ئەوەی پەیوەندی دەکرد شوفێرە تایبەتەکەم بوو، بەپەرۆشیەکی زۆرەوە وتی:

- خاتوون پێویستە هەر ئێستا برۆین.

ترسێك کەوتە دڵمەوە، بیرم لەدایکم و باوکم کردەوە:

- شتێك ڕوویداوە؟

- من لای باخی گشتی چاوەڕێتان دەکەم تکایە زۆر خێرا بگەن!

ئەو ترسە تەواو دایگرتم:

- چی بووە بیڵێن؟ دەتەوێت شێتم بکەیت؟

- دایك و باوکت تووشی کارەساتێك بوون، پەلە بکەن چاوەڕێی ئێمەن.

ئەمە بەس بوو کە بەتەواوی ئەقڵ لەدەست بدەم هاوارم کرد:

- چی بووە؟

- شتێك نیە، سوێند دەخۆم، مەترسیەکانیان تێپەڕاندووە، چاوەڕێی ئێمەن.

چیم بکردایە، چۆن بوەستامایە! ئەو ڕێگەیە ئەوەندە دوورو درێژ بوو بۆم....لەلایەك دایکم و باوکم لەگەڵ ئەجەل و لەلایەکیش حاڵی ڕۆحم کە بە خەمی پوورە فاطمەو مستەفا وێران بوو بوو.

## باوکم؛ ڕقی لەدین بوو:

لەگەڵ بینینی دایکم و باوکم لەژوورێکدا کە بەسەر دەریادا دەیڕوانی لەتایبەتترین نەخۆشخانەی ئەو شارەدا، هەناسەیەکی قووڵم هەڵمژی هەردووکیشیان ئەو کارەساتەیان زۆر بەسادەیی بەسەر هاتبوو، زانیارییەکان ڕوون بوون، کەزانیم لەبارێکی ترسناکدا نین زۆر سوپاسی خوام کرد، دایکم و باوکم هەر کە منیان لەپێش خۆیان بینی حاڵی خۆیان لەبیر کردو پرسیاریان لەڕازی کردن یان نەکردنی مستەفا کرد، دەردی ئەوان ئەو خۆشەویستیە شاراوەو هەڵقوڵاوەی من نەبوو بۆ ئەوان، بەڵکو سوودمەندبوون بوو لە ئەزموون و دەست پاکی مستەفا، منیش وتم:

– نەخێر لەبەر ئەوەی دایکی وەفاتی کرد نەمتوانی ئەو قسانەی لەگەڵ بکەم، باوکم قسەکانی پێ بڕیم:

– باشە باشە ئەو ژنە هەر لە لەزگە دەچوو، دەتوت ئەو تۆی گەورە کردووە، لەدەورت دەگەڕاو خەمی دەخواردی وەڵامم نەدایەوە، حاڵی کردنی باوکم لەڕاستیەکان مەحاڵ بوو ئەو تێنەدەگەیشت.

– بەڵام تۆ واز لە مستەفا مەهێنە.. بڕۆرەوە بۆ لای.. ئەگەر ئەو ڕازی بکەین، هەم ئەندامێکی باش و خاوەن ئەزموون، هەم کەسێکی دەست پاك و متمانە پێکراو بۆ گەنجینەی پارەکانمان بەدەست دەهێنین، ئەگەر نا من بە ئیمان و دین و ئیمامەتەکەی سەرسام نیم،

ئەزموونەکانی کە پێویستمانە بۆ ئێمە بەکاربهێنێت ئەوەی تریشی بۆ خۆی، هەروەها دەبینین لەناو خانمەکانی کۆمپانیادا دەکرێتەوەو ئێمەش لەیەکێکی تر لە دەمارگیرەکانی ئەم مەملەکەتە ڕزگارمان دەبێت.

– ئاه باوکە! ئەقڵ و ڕۆح و دەروونی تۆ چەند پڕن لە فیکرو بیرکردنەوەی هەڵەو تاوان، کە پاککردنەوەیان لەم تەمەنەتدا کارێکی ئەستەمە، ئاه ئەگەر ئەو کەسانەت باش بناسیایە دڵنیام وەکو من حەیران دەبوویت بۆیان.

مامۆستا ئاقڵەکانی باوکم چەندین ساڵە ئەمەیان تێگەیاندووە" کۆنەپەرستەکان دەیانەوێت مەملەکەتەکەمان لە دەست دەربهێنن، ئەگەر ئەمە بەڕاستی ڕوویدات چەندە سەربەستی و دیموکراتی هەبێت هەموویمان لێ قەدەغە دەکەن لەبەر ئەوە پێویستە بەر لەگەشەسەندنی گەنجە دیندارەکان بگرین، تەنانەت دەبێت بەر لە چرۆکردنیان سەرکوتیان بکەین".

لەبەرئەوە باوکم هەموو کات لەهەموو هەوڵێکی بچوککردنەوەو کەم کردنەوەی ئەو جۆرە کەسانەدا دەستی هەبوو، (قۆناغی ۲۸ی شوبات) ئەو پرۆسە توندڕەوییەی بەشێوەیەکی دڕندانە بەرامبەر کەسە دیندارەکان گیرایەبەر، لەبیرمە چۆن باوکم فرمێسکی خۆشی دەڕشت.

چۆن لەبیری دەکەم؟ باوکم چەند خۆشحاڵ دەبوو کاتێک ئەوانی دەبینی بەرەو زیندان و سزادان ڕاپێچ دەکران هەمووکات چەپڵەی لێدەدا بۆ گرتن و ئازاردان و نەهێشتنی گەنجە دیندارو پارێزکارەکان، لەبەرامبەر ئەمەشدا یارمەتیدەرێکی ماددی باش بوو بۆ ئەو گروپ و لایەنانەی شەڕی یاسایی و نایاساییان لەدژی ئەو کەسە دیندارانە سازدەکرد.

باپیرەم هەرچەندە خۆی دیندار بووە، بۆ خوێندنێکی باشتر باوکمی ناردووەتە فەرەنسا، بەداخەوە باوکیشم بە داماڵراوی لە باوەڕو کلتوری خۆی و گرنگی نەدان بەپیرۆزیەکانییەوە گەڕاوەتەوە.

باپیرەشم کە بەو خەفەتەوە تەمەنی بەسەر برد دەیوت" ئەوە گەورەترین هەڵەی من بوو"، وابزانم هەر بەو خەمەشەوە سەری نایەوەو مرد.

لەخێزانەکەی ئێمەدا خواو دین و تەنانەت بۆنە ئایینیە ئاساییەکانیش بەسەر زماندا نەدەهاتن. قوربانی کردن بەدڕندەیی و حەج کردن بەلاسایی کردنەوەو سوودگەیاندن بەعەرەبەکان ناسێنرا بوو، لەدەوروبەرێکی وادا بووین کە استغفر الله هاوڕێکانی باوکم پێکەنینیان بەباسی خواو قورئان و ئیمان دەهات، کەسانێك بوون چاویان جگەلە پارەو سەروەت شتێکی تری نەدەبینی.

ئیتر منیش لە ژینگەیەکی لەم جۆرەدا گەورە بووم و شێوەم گرت تەنها یاسا کە لەمن گەیەندرا بوو ژیانێک بوو لەبەرزترین و

شکۆمەندترین حاڵدا، لەبەر ئەو ئازادیە زۆرەی پێم درابوو هەر لەسەرەتای خوێندنی ناوەندیمەوە خەیاڵی " هاوڕێی کوڕ" هاتبووە سەرم، من دوور لە پاکی و بێگەردی و پارێزگاری گەورەکرابووم، بەتایبەتیش یاساو هەڵویستە ئاینیەکان بەپێشهاتێکی کەم و بێبایەخ دەهاتە پێش چاو.

لەگەڵ ئەمانەشدا لەبەر ئەوەی فەلسەفەی ژیانم هەڵەبوو، هیچ کات هەستم بەئاسوودەیی ڕاستەقینەو دڵخۆشی نەدەکرد، زۆر جار سەرم دەکردە سەر وەرگرتنی چارەسەری دەروونی. لەکۆتایی ئەم تەقەلایانەمدا زۆر باش تێگەیشتم کە من لەدەروونمدا نوقسانیەك و حەسرەتێك و بۆشاییەکم هەیە کە نازانم چ ناوێکی لێ بنێم، بەلام هەست بەنەبوونی دەکەم ئەو هەموو دەسەلات و سەروەت و ژیانە بەرزەی من تیای بووم و خەڵکانێك ئێرەییان پێ دەبردم، ئاسوودەیی ڕۆحی پێ نەدەبەخشیم و نەدەبووە ڕووناکیەك بۆ تاریکایی ناخم.

لەبەر ئەوە بوو کە بەناسینی خەڵکی ئەنادۆڵ و تێگەیشتن لە پەروەردەی خێزانیان، من دنیایەکی زۆر جیاوازترم دۆزیەوە، لەکۆتایشیدا بوومە عاشقی ئەو دوو مرۆڤەی بەبەخشندەیی و یارمەتی دان و خاوەنداریەتی جوانترین ڕەوشتەکان ناسراو بوون.

ڕۆحی خاوێن و دوور لە ماددیەت و بەرژەوەندی خوازی، هاوڕێیەتیەکی دروست و بێ بەرامبەر سیمایەکی ڕازاوە

بەزەردەخەنەیەکی شیرین و دۆستایەتیەکی گەرم و یارمەتیدانێکی دڵسۆزانە لەپێناوی خوادا....

بەڵێ هەر ئەمە بوو ئەوەی پێ دەبەخشیم کە نە لە پاریس و نە لە نیۆرك و نە لەهیچ جێیەکی تری گەشتەکانمدا هەستم پێ نەکرد بوو، دیار بوو ئەوەی من لەوسەری دنیا بۆی دەگەڕام لەڕوویەکی شیرین و درەوشاوە وەك خۆری مرۆڤێکی سادەی ئەنادۆڵدا دۆزیمەوە، بەناسینی ئەو دنیا جیاوازە کە گرنگترین دۆزینەوەی ژیانم بوو. ئیتر جیاواز ترو بگرە پێچەوانەی خێزانەکەم بیرم دەکردەوەو شێوازی ڕێ ڕۆشتنەکانم لەگەڵ ئەوان جیاکردەوە هەموو دوعاو ئارەزووم ئەوەبوو باوکم بە تێگەیشتن لەم ڕاستییە لە ئەسیری پارە ڕزگاری ببێت و گوێ لە دڵ و ویژدانی بگرێت.

## ئەو دوو کۆچەریەی وانەی مرۆڤدۆستی دەڵێنەوە:

بەئومێدەوار بوونی دڵم و خەیاڵەکانی سەرمەوە گوێم بۆ چۆنیەتی کارەساتەکەی باوکم و دایکم دەگرت، کە لێپرسراوێکی نەخۆشخانەکەو سەربازێك هاتنە ژوورەوە.

- شایەت حاڵەکانی کارەساتەکەمان دۆزیەوە کاك عەقیل. خانمێکی سی بۆ سی و پێنج ساڵانەی خەمبارو پیاوێکی تەمەن چل ساڵانەی بەشەرم، ئەو دوو گوندنشینەی وەك دوو هاوسەر دەردەکەوتن

هێڵـەکانی ڕوخسـاریان تەقـەڵاو مانـدوو بونیـانی بەدەسـت ژیـانی سەختەوە نیشان دەدا.

بـەجل و بەرگیشـیاندا دیـار بـوو کەسـانێکی هـەژارو کـەم دەسـت بوون، کە بەو حاڵە لاوازو کەم تواناییەوە بینیمن زۆر ئـازارم چەشـت، زۆریش پەرۆشی حاڵیان بووم.

دەبێت باوکم لەبەر یارمەتیدانی ئەوان و بۆ خەڵات کردنیـان داوای کردبێتن؟ یاخود ئەگەر بووبێتنە هۆکاری ئەو کارەساتە بۆ سـزادانیان بانگی کردوون؟ هەرچەندیش لەسیمایانم دەڕوانی هێمایـەك نـەبوو بـۆ تێگەیشتن، ئەوەندە دڵم بۆ ئەو مرۆڤە داماوانە دەسوتا کە بێ تـاوانی و بێچارەیی و پاکییان تیادەبینرا، باوکم شانەکانی بەرزکردەوەو بـە توندی هەڵی دایە:

– ئێوە ئەو جانتایەتان برد؟ پڕ بوو لەسەنەدو بەڵگەنامەو پارەکـانم. پیاوی هەژار بەگریان و زەبونیەوە وتی:

– نەخێر گەورەم، ئێمـە شـتێکی لـەو جۆرەمـان نـەدیوەو نـەبردووە، باوکم بەتووڕەییەوە هاواری کرد:

– کەواتە، ئەی لەکوێیە؟

بەبێ دەسەڵاتیەوە سەری دانەواندو وتی:

– هەموو شتێکمان لەجـەنابی پـۆلیس گەیانـدووە گـەورەم لەوکاتـەدا پۆلیسەکەش هاتە قسە:

– گەورەم لەبەر ئەوەی ئەمە لە دەرەوەی شار ڕوویداوە، ڕێگرە چەکدارەکان دەستیان تیایدا هەیە، ئێمە ئەو زانیاریانەی پێویست بوو لەمانمان وەرگرت. ڕووداوەکە بەم شێوەیە گێڕدراوەتەوە:

ئێوە کاتێك لەگەڵ خانم لەشاخەکانی تۆرۆسەوە بەرەو خوار دێن، بەهۆی بارینی بەفرەوە بەرەو کەندەلانێك خلۆر بوونەتەوە.. کە ئەوێ لاپاڵێکی سەختەو لەخواریەوە دۆڵێك هەیە، ئێوە بە ئوتومبێلەکەتانەوە تەقلەتان داوەو تا خوارەوە خل بوونەتەوە بە هۆی ئەوەی لە شوێنی ڕووداوەکەدا شوشەی مەیمان دۆزیوەتەوە، ئەوە دەردەکەوێت کە ئێوەش لەوکاتەدا مەست بوون.

باوکیشم وەك ئەوەی زۆر شتێکی ئاسایی بێت بەتووڕەییەوە بەگژ پۆلیسەکەدا چووەوە:

– بەڵێ، خواردبوومانەوە سزاکەشی هەرچی بێت وەریدەگرین بەلام بابەتە گرنگەکەم پێ بڵێن جانتاکە لەکوێیە؟

پۆلیسەکەش وەك منداڵێکی پێگەیشتوو، بەڕەقیەکەوە لە باوکمی ڕوانی و وەلامی دایەوە:

– ئەم خێزانەش کە لەکۆچەریەکانن لەوکاتەدا سەرقاڵی مەڕ لەوەڕاندن بوون، کاتێك ئەو کارەساتەی ئێوە دەبینن، لە کەندەلانەکەوە دێنە خوارەوەو ئێوە بەبرینداری لە ئوتومبێلەکەتان دەردەهێنن، دواتر هاوڕێکانی تریان بانگ دەکەن و بەیارمەتی ئەوان دەتان گەیەننەوە سەرەوە، بەهۆی داخستنی ڕێگەکانیشەوە ئێوە

دەگەیەننە ناو چادرەکانیان و لەسەرمای ئەو شەوە ڕزگارتان دەکەن، ئەگەر ئەم خێرخوازانە نەبونایە کە ڕایان کردووە بۆ یارمەتیتان یان لەسەرمای ئەو شەوەدا دەتان بەست یاخود دەبوونە ژەمە خۆراکی ئاژەڵە دڕندەکان.

هەستم بەشەرمەزاری دەکرد و ئارەقی خەجاڵەتیم دەردەدا بەرامبەر ئەو خێزانە بەڕێزو خێرخوازە کە بەنیەت باشی یارمەتی دایك و باوکمیان دابوو، بەڵام ئەوانیش کەمترین سوپاس گوزاری و منەت باریان نەدەنواند، خودایە، ئەمە چی بوو؟ خەریك بوو بەتەواوی شێت دەبووم کە دەمبینی کەمترین هەستی مرۆڤایەتی لەدڵیاندا نییە بەرامبەر هەژارەکان. هەرچی بێت من چەند ساڵی تەمەنم لەگەڵ ئەو جۆرە مرۆڤانەو لەو دنیایەدا ژیابووم، بیر لێ کردنەوەشی ئازاری دەدام پۆلیسەکە لە ڕوون کردنەوەی ڕووداوەکە بەردەوام بوو:

– جانتاکەشتان بە هەموو بەڵگەنامەکانی ناویەوە لە چەکدارە ڕێگرەکان سەندراونەتەوەو لای ئێمە پارێزراوە، ئەم کەسانەی کە ئێوە بەتاوانبارتان زانین لەگەڵ کرانەوەی ڕێگەکاندا ئێوەیان گەیاندۆتە نەخۆشخانەی ئەو شارە هەموو خەرجیەکانیشیان لە گیرفانی خۆیان داوە، ئیتر لەوە زیاتر خۆم پێ ڕانەگیرا بەتووڕەییەوە ڕووم کردە باوکم:

– ئێوەش ئەم مرۆڤانەی کە دەبێت دەستیان ماچ بکەین بۆ لێپرسینەوە بانگتان کردوون؟ من لەبەرامبەر ئەم دوو مرۆڤە بەڕێزەدا

خەریکە دەتوێمەوە، ئێوەش تەنانەت داناچڵەکن؟ ئەمە چ جۆرە ڕەفتارێکە؟ ئێوە هەست و ویژدانتان چی بەسەر هاتووە؟ بۆ خاتری خوا دڵتان بۆتە بەرد!؟ باوکم وەك ڕەفتاری هەمیشەیی خۆی، وەك ئەوەی گوێی لێ نەبووبێت:

– کەواتە ئەو پارەیەی خەرجیان کردووە، بەزیادەوە پێیان بدەنەوە با بڕۆن

پیاوەکە بەسەرنجێکی وردەوە ڕوانیە باوکم، بەدەنگێکەوە کە ویژدانەکان دەهەژێنێت وتی:

– گەورەم ئێوە هیچ لە خوا ناترسن؟

ئەو ئێوارەیە لەپێناو ڕزگار کردن و بردنە سەرەوەی ئێوەدا لەو کەندەڵانەی تێی کەوتبوون خۆم و هاوسەرەکەم زۆر بەسەختی توانیمان ڕزگارتان بکەین، بەهۆی ئەوەشەوە هاوسەرەکەم کۆرپەیەکی لەبار چوو، کە ماوەی دە ساڵە چاوەڕێی منالین، ئێمە گیانێکمان کردە فیدای ڕزگار کردنی ئێوە، هێشتاش ئێوەمان لەدەرەوە بەجێ نەهێشت ئێوەش چی دەڵێن!

ئەو بەیانیە کە ڕێگاکان کرانەوە، پارەیەکم نەبوو تاکو هاوسەرەکەم کە بەردەوام خوێنی لێ دەڕۆیشت و ئێوەش کە بە برینداری لە لای من بوون بگەیەنمە نەخۆشخانە، بۆیە لە خزمەکانم قەرز کرد، کاتێك چاوەڕێی سوپاس کردنێکمان لە ئێوە دەکرد، هاتن بەدوامانـدا و هاوسەرەکەمیان بە زۆر لەنەخۆشخانە هەستان لەبەر

ئەوەی ئێوە بانگتان کردبووین، دەبینن کە ئەو داماوە توانای بەپێوە وەستانی نیە.

تەماشاکەن گەورەم! ئێمە لە شاخ و داخەکان گەورە بووین گەورەکانمان جوان قسەکردنیان فێر نەکردووین، بەڵام پیاوەتیان فێر کردووین، ئێمە لەبەر پارە نا بەڵکو لەبەر مرۆڤایەتی یارمەتی خەڵك دەدەین، ئامادەین هەموو ئەوەی هەمانە خەرجی بکەین لە پێناو یارمەتی دانی غەریبێك، لێقەوماوێك یان هەر کەس کە پێویستی پێمان بێت، گیانی ئەوان بەگیانی خۆمان دەزانین و ماڵەکەشیان ئەمانەتە لە لامان، ئێمە لەگەورەکانمانەوە ئەمەمان بینیوە و لێیانەوە فێر بووین، ئەمەش بۆ سوپاس کردنی بەندەکان ناکەین، بەڵکو بۆ بەدەستهێنانی ڕەزامەندی خوا دەیکەین، پارەی کەسانێکی وەکو ئێوە دەست و گیرفان و گەدەمان پیس دەکات، خوا بەنسیبمانی نەکات.

ئەو ڕەت دانەوەیەی پیاوی هەژار بەرامبەر باوکم دایەوە، هەموو هەستەکانمی ووروژاند و دڵمی داچڵەکاند.. بێ دەنگیەکی قووڵ ژوورەکەی داگرت وەفاداری و مرۆڤ دۆستی ئەو دوو کەسەی وەکو شاخ لەبەردەم هەمووماندا چەقی بوون، گیانی بەبەر بێ ڕۆحەکانیشدا دەکرد، بەڵام باوکم تا ئەو کاتەش هەستیار بوونێك لە ڕووخساریدا دەرنەدەکەوت، لەوانەیە ئەوە بۆ یەکەم جار بوو بێت خۆی

بەقەرزداری ئەو دوو مرۆڤە زانیبێت، کە سەری دانەواندو ناچار بوو لەبەر خۆیەوە وەك بڵێت " ببورن.." ورتە ورتێکی لێوە دەرهات.

ئەو دوو مرۆڤەی کە شایستەی ئەوە بوون سەدان جار لە شەرمەزاریدا سەریان بۆ دانەوێنرێت و پێیەکانیان ماچ بکرێت، بە سەربەرزی و بێچاوەڕێی سوپاس کردن ڕۆشتنە دەرەوە. منیش دەمم لەباوکم کردەوەو چاوەکانم تێ بڕی، هەموو ئەو نەفرەت و ڕق و تووڕەییە ئەو چەند مانگە لە دڵمدا دروست بوو بوو دانە دانە هەڵمڕشتن، دەمویست ئەو وانەی مرۆڤ دۆستیەیان تێ بگەیەنم کە ئەو دوو مرۆڤە هەژارو فیداکارە بەکەسێکی بەندەی پارەی وەکو باوکمیان دەدا، پرسیارێکی سرکەرم لە باوکم کرد:

– ئەگەر لەلای ئێوە ڕوداوێکی لەو جۆرە لەکەسانێکی تر ڕووی بدایە ئەو فیداکاریەی ئەوانتان دەکرد؟

– .....

– کەوایە ئەوەی لە ژیانمدا لێتان فێر بووم تا ئێرەیە. نەمتوانی زیاتر لە ژوورەوە بمێنمەوە، دەرگاکەم دا بەیەکداو ڕۆیشتمە دەرەوە، ئەگەر نا لەبەر تووڕەیی زۆرم، دوور نەبوو هێرشی ڕق و کینەم بەسەریاندا بتەقێتەوە.

بەڕاکردن خۆم گەیاندە ئەو دوو مرۆڤە بەڕێزە و تاوم دایە دەستەکانیان بۆ داوای لێبوردن، خانمەکە بەدنیایەك لە خۆشەویستی و ڕێزەوە لێی پرسیم:

– تۆ چی ئەو پیاوەیت؟

– من کچی ئەوم

دەستەکانی بۆ ئاسمان بەرزکردەوەو وتی:

– ئای خوای مەزن تۆ لە وشکانیەوە ئاو دەردەهێنیت و ئاویش لە جێیەك وشك دەکەیت. کچێکی وەك فریشتە دەبەخشێتە مرۆڤێکی ئاوا ستەمکار. ئای خوای پەروەردگارم! باوەشی بەمندا کردو نزای بۆ کردم:

– خوای گەورە بتکاتە دۆستی کەسە بەڕێزەکان لەدڵەوە"ئامین"ێکی گەورەم بۆ کرد، ویستم کەمێك یارمەتی بکەمە گیرفانەکانیان، بەڵام ڕێگەیان پێ نەدام؟!

بە سەرسامیەکی زۆرەوە لەو دڵ فراوانی و بەخشندەییەی ئەو دوو مرۆڤە قارەمانەی کە جلەکانیان کۆن و پێڵاوەکانیان دڕاوو فرمێسکەکانیان لە چاو قەتیس مابوو دەمڕوانی و پێی وێران دەبووم.

چەند حەزم دەکرد منیش کەسێك بوومایە لەو دنیا پاك و بێگەردەی ئەواندا، لەکاتێکدا ئەو کەسە بێ نوورو ساردوسڕو دوور لەویژدان و مرۆڤایەتیانە منیان بەچاو و سەری خۆیان دەزانی، من دەمویست ببمە قاچ و پێیەکانی ئەم کەسە غەریبە گەرموگوڕ و بەخشندە و میهرەبانانە، پاکی و دڵفراوانی ئەو دوو هاوسەرە منیان عاشقی خۆیان کرد بوو. ئەو باوکەم کە وامدەزانی هیچ پێی کاریگەر نەبووبێت، وادەردەکەوت بۆ یەکەمین جار وانەیەکی لەو خێزانە

کۆچەریە وەرگرت بێت، هەرچەندە نەیدەویست خۆی وانیشان بدات، بەڵام چەندجارێك خەمی ئەو هەڵەیەی لەلای دایکم باس کردبووەوە تەنانەت باسی کرد بوو کە شەوێك لە خەونیدا باپیرم پێی وتووە " کوڕم من پێت خەجاڵەت دەبم" بەمەش ئازاری چەشت بوو، ئیتر لەچاوەکانی باوکمدا نەرم بوونێکم هەست پێ دەکرد ئەمەش زۆر دڵخۆشی کردبووم بەردەوام بۆی دەپاڕامەوە.

## چۆن بەرگەی ئەو پەرۆشیە بگرم:

بەڵێ هەر ئەو شەوە بڕیارمان دا بە خێزانی بچینە سەردانی مستەفا بۆ سەرە خۆشی لێ کردنی، بەو بەهانەیەشەوە دوا داواکاریمان و تەنانەت دوا پاڕانەوەی منیشیان پێشکەش دەکرد. ئەگەر مستەفا پەسەندی بکردایە باوکم بۆ کار دەیهێنایە لای خۆی و هەموو تواناو یارمەتیەکیشی پێ دەبەخشی، چ یارمەتیەکیش! کۆمپانیاکەی دەخستە بەردەستی، پەروەردگارا! پلانی ئەم کارە چەندە خۆشحاڵی کرد بووم، دەی وایە من دووبارە ئەوم دەبینیەوە! پەرۆشی و هەستیاریەکی بێ ئەندازە هەموو گیانمی تاودا بوو دوای چەند ڕۆژێك لەعەسرێکی درەنگ وەختدا کەوتینەڕێ، بەگەیشتنمان بەو شارە شیرینەو چوونە ناو گەڕەك و بەردەم ماڵۆچکە گڵێنە یەك نهۆمیەکەی ئەوان ئیتر وردە وردە هەناسەم توند دەبوو.

مستەفا کە دەرگاکەی کردەوە ئێمەی بینی زۆر سەرسام بوو، دەمزانی ئەو ئەدەب و ڕەوشتەی ئەو هەیەتی هەرگیز ئێمە لەوێدا ناگەڕێنێتەوە، بەدڵنیایی فەرمووی دەکردین بۆ ژوورەوە چونکە من زۆر باش ئەوم دەناسی، سەرسام بوونەکەی خۆی دەربڕی:

- هەرگیز چاوەڕێی ئێوەم نەدەکرد، ئەمە لای من بەو مانایە دەهات:" ئێوە چەند بێ شەرمن من نازانم چۆن لە دەستتان ڕزگارم بێت!"، ڕۆشتە کەنارەوەو فەرمووی کردینە ژوورەوە کاتێك دووبارە پێم نایە ناو ئەوماڵەی ژیانمی سەراپا گۆڕی و خۆمی بەخۆم ناساند، هەموو گیانم گەرم داهات و بەبێ ویستی خۆم دەلەرزیم.

دایکم کە لەو حاڵەدا بینیمی ئاگاداری کردمەوە:

- ئارام بەرەوە کچم ئەم پەرۆشیەت چییە؟ خەریکە دەبورێیتەوە...؟

بەڵێ بەڕاستی خۆم بەزۆر ڕاگیردەکرد تاکو نەکەومە سەر زەوی. بەبینینی مستەفاش هەموو ناخم شێوابوو، لەئامێز گرتن و هەستە دایکانەکەی پوورە فاطمەش بەهیچ جۆرێك لەبەرچاوم نەدەڕۆیشت، چەندە بیرم دەکرد..!

ئاه لەم ماڵە! تۆ منت بەخۆم ناساند مرۆڤایەتی و خۆش ویستنت فێرکردم، بەجیهانی شەرم و ئەدەب و ڕێزت ئاشنا کردم.

ڕۆشتینە ناو ئەو ژوورە بچوکە پاکوخاوێن و ڕازاوەیەیٚ لەکەشێکی ئـارام و ئاسـوودەدا مرۆڤـی مەسـت دەکـرد. ئاشـکرا بـوو ئەمـە ڕەنگدانەوەی ڕۆحی ئەو کەسانەیە کە لەم ماڵەدا ژیاون..

سەرۆکی شـارەوانی و جـەنابی پارێزگـاریش کـە هـاتنی باوکمیـان بیستبوو، پاش کەمێك ئەوانیش گەیشـتنە ئـەویٚ.. بـاوکی بـیٚ ئـارامم دیسان بەشێوازی قسەکردنی تایبەت بەخۆی بەشێوەی فەرمان کردن دەستی کرد بە قسە لەگەڵ مستەفا کە بەپێوە ڕاوەستا بوو:

- ئەی گەنج... من لە ژیانمدا نەچوومەتە بەرپێی هیچ کەسـێك بـەڵام دەبینیت کە هاتومەتە لای تۆ، لەبەر ئەوە باش گویٚ بەوتـەکانم بـدە، دەمەوێت گەورەترین شانسی ژیانت بخەمە بەردەست.

بەم پێشەکیە دوور لـە ڕێزدانـان و بـیٚ هەسـتەی زۆر تـوورە بـووم دیسان سەرەتایەك بوو بۆ تێکدانی هەموو شتێك. لـەخوا دەپاڕامـەوە کـە بـە ئومێـدەوە لـەم ماڵـە دەربچـین، بـاوکم کـە وەکـو شـێر خـۆی بەبەهێزو سەپێنەر دەزانی دەستی پێکردەوە:

- هەڵەکەم تێگەیشتم، ئێمە خەڵکانی ئەنادۆڵیمان بە نەزان و نەفام و دواکەوتوو دەزانی دیارە کەوانیە، ئێمـە خـاوەنی پـارەین و ئـەوانیش خاوەنی پیاوەتی و مەردایەتی، لەبەر ئەوەی ئەمەمان درەنگ زانیوە، تاوانبارین، هەر بۆیە لە تۆوە داوای لێبوردن لەهەموو خەڵکی ئەنادۆڵ دەکەم، بێگومان ئەمڕۆش بۆ چاککردنەوەی ئەو هەڵەیەمان هاتووین.

مستەفای زیرەك كە دەیزانی سەرەنجامی ئەو قسانەی باوكم بەكوێ دەگات، بە هەڵوێستەیەكی پێچەوانە دەستی بەرزكردەوەو باوكمی بێدەنگ كرد، بەدەنگێكی خەمبارەوە وتی:

- من وام گومان دەبرد بۆ پرسەی دایكم هاتبن، بەڵام هەڵە بووم پێویست ناكات ئەمانە بڵێن، ئەگەر باسەكەی هەر ئەمە بێت لەخۆڕا خۆتان ئەزیەت داوە، ئەوەی كە مستەفا وتی، باوكمی شەرمەزار كرد بۆیە هەستی بەهەڵەكەی كرد:

- دووبارە داوای لێبوردن دەكەم، ئێمە بەداخەوە فێری ئەم نەریتانە نین، بەڵام بەڕاستی ئێمە بۆ سەرە خۆشی وەفاتی دایكت هاتبووین، خۆت خۆش بیت، بێگومان لەگەڵ مردوودا نامرین. دەبێت بەردەوامی بەژیان بدەین، تۆ ئیتر ئەبێت لەبیری خۆتدا بیت، كارێك بۆ داهاتووت بدۆزیتەوە، لەم سەردەمەدا ئیمامەت سكت تێر ناكات، تۆ كارێكت پێویستە كەشیاوی لێهاتوویەكەت بێت.

دیسان باوكم لە قسە ڕەقەكانی بەردەوام بوو، تەنانەت سەرەخۆشیەكەشی گەڕاندەوە بۆ سەر باسی ئیش كردنەكە، مستەفا بەهەموو پیاوەتی خۆیەوە دووبارە ناچار بوو قسەكان بەباوكم تەواو بكات:

- بۆ سەرەخۆشی كردنەكەتان زۆر سوپاستان دەكەم بۆ مەسەلەكەی تریش... من ئێستا بیری لێ ناكەمەوە لەكاتی پێویستی خۆیدا كار دەدۆزمەوە، ئێستا نوێژی عیشا كاتەكەی نزیكەو من

لەمزگەوت ئەركم هەیە، لەسەر ئیزنتان دەبێت بڕۆم ئەمە بەمانای دەركردنی ئێمە دەهات بە شێوەیەكی ڕێزو تەقدیرەوە" لەگەڵ ئێوە هیچ ئیشێكم نەماوە، ئیتر ئەگەر بڕۆن زۆرباش دەبێت"..بەڵام باوكم نیەتی قبوڵ كردنی ئەمەی نەبوو بۆیە وتی:

– فەرموون... بەئەركی خۆتان هەستن ئێمەش لێرە چاوەڕێتان دەكەین، كە مستەفا ڕۆیشتەدەر، باوكیشم ئەوەی لەدڵیدا بوو كەمتەرخەمی نەكرد لە دەربڕین:

– كەسی نەفام و كۆنەپەرست.. ئەو نیعمەتەی هاتۆتە بەرپێی لەقەی لێ دەدات. مرۆڤ تا دوا هەناسەشی پێویستی بەپارە هەیە، كەسێكی بەناوبانگی وەك من هاتۆتە بەردەرگاكەی خەریكە یاری بە شانسی خۆی دەكات.

## چەند میواندارییەكی جوان بوو:

مستەفا لەگەڵ گەڕانەوەیدا ئەوەندەی میوەو شیرینی و پێویستی میوانداری هێنایەوە كە سەرسام بووین لەوكاتەی شەودا لەكوێ بەدەستی هێناون!

ئەمە كلتوری ئەنادۆڵیەكان بوو، بە ئیمان و قورئان پەروەردە كراون. بە مرۆڤ دۆستی و ئەدەب و ڕێز گەورە كراون لەسەر مۆدێلی ژیانێك ڕاهێنراون كە خزمەت كردنی میوان كەمترینیەتی.

ئەمە ڕەوشت و تێگەیشتووییەك بوو کە ئەگەر دوژمنەکەشیان بهاتایە ماڵیان تا تێریان نەکردایە و جوانترین خزمەتیان پێشکەش نەکردایە نەیاندەهێشت بڕوات، ئەوەی منی عاشق کردبوو، خەونەکانمی ڕازاندبوەوەو لە ڕۆحمدا ڕۆچوو بوو هەر ئەم تێگەیشتووییە جوانە بوو، هەمووان پێکەوە بەو دڵفراوانی و دەست ئاوەڵاییەیان سەرسام مابووین، مستەفا کە وەکو دەست ڕەنگینی کچێکی گەنج خواردنەکانی ئامادەکرد بوو بەدەستەکانی خۆی پێشکەشی کردین، هەمووانی حەیران کردبوو.

دایکم و باوکیشم کە لە نزیکەوە ئاگاداری ئەم پیاوەتی و هەست بەرزی و ڕەوشتەی بوون تێگەیشتن کە بۆچی منیش وا دڵدارو حەیران ماوم بۆیان، باوکم بێ دەنگی بڕیو دەستی بەقسە کردەوە:

– مستەفا دەستت خۆش بێت کوڕم، بۆیەکەمین جارە لە ژیانمدا لەماڵێکی گلێدا دانیشم و ئەم خزمەتە بکرێم! بەڕاستی کاریگەر بووم بە دەروون پاکی ئێوە. ئەگەر بتانەوێت ئێستا بچینە سەر باسە بنەڕەتیەکە، لەدڵەوە دوعام دەکرد کە دیسان باوکم بەقسەو ڕەفتارەکانی نەبێتەوە هۆی ناڕەحەت کردنی مستەفا. کە باوکم دەستی کردەوە بەقسە، من بەردەوام سەرنجی مستەفام دەدا بۆ ئاگادار بوون لە بەرپەرچ دانەوەکانی ئەو. بەڵام ئەو بەهیچ جۆرێك ئاوڕێکیشی بەلای مندا نەدایەوە. بۆ ئەوەی چاوی نەکەوێتە سەرم، ئەوەی لەدەستی بهاتایە دەیکرد. تەقوا لەناخی ئەودا بەجۆرێك بوو،

که ئەگەر هەموو دنیا پێکەوە هەوڵی خەڵەتاندنیان بدایە، ئەو لایەکی لەنەفسی نەدەکردەوە، باوکم لەوتە تێکەڵ و پێکەڵەکانی هەر بەردەوام بوو:

– ئیتر لەدنیادا بەتەنهایت داهاتوویەکت پێویستە. سەیرکە بۆ ئەمە چیت پێ دەڵێم: لای ئێمە هەم ئیش هەیە بۆتۆ، هەم ئێمەش لە پێویستی کەسێکی دەست پاکی وەك تۆداین، ئێمە لە ئەزموونی تۆ سوودمەند دەبین و تۆش لەپارەکەی ئێمە، ئەگەر ئەم داوایە قبووڵ بکەیت دەبیتە خاوەنی دەسەڵاتێك کە ڕەنگە خەیاڵیشت نەکردبێت تەنانەت داهاتەکەشت خۆت دیاری بکە، هەرگیزیش دەست لە بڕیارەکانت وەرنادەین.

ئەوە زۆر باش بزانە کەهیچ کەسێك ئەم دەسەڵاتە ڕەهایەی پێ نادرێت و هیچ ئەندامێك پلەی تۆی نادرێتێ، بۆچی ئەمانە دەڵێم؟

ژیانی سەربەرزانەو بەڕەوشتی تۆ کاریگەری زۆر لەسەر ئیلکای داناوە، ئەویش لەسایەی تۆوە ژیانێکی نوێی ناسی، تا ئەمڕۆ بەو جۆرە ئاسوودەو دڵخۆش نەبووە. تۆ بوویتە یارمەتیدەری کچەکەم، منیش دەمەوێت یارمەتی تۆ بدەم، مەسەلەکە بەم جۆرەیە.

باوکم تا قسەی بکردایە هەڵەی زیاتری دەکردو منیشی زیاتر شەرمەزار دەکرد، نەیدەزانی قسەکانی بەرەو کوێ دەچن و ئەو کەسەی ئەم خەریکە بەرامبەری قسەدەکات بەتەواوی لەڕەگەزو بیرکردنەوەی ئەو، زەوی تا ئاسمان جیاوازە.

سەرەڕای هەموو ئەو داواکاریە سەرسەختانەی باوکم، مستەفا دیسانیش بە ڕەوشت بەرزی خۆیەوە وەڵامی دایەوە:

- سەرەتا سوپاسی زۆری ئەو تەکلیفانەت دەکەم، بۆ ئەو بیرکردنەوەیەشتان لەمن هەر سوپاس دەکەم، منیش دەمەوێت ئێوە بزانن کە من ئێستا لەبیری دۆزینەوەو دەست کەوتنی کاردانیم، بەهۆی چەند کارێکی بچوکی خۆمەوە جارو بار لەدەرەوەو ناوەوەی وڵات لە دۆستەکانمەوە پارەیەکم پێ دەگات، کە خەرجی ڕۆژانەی خۆمی پێ دابین دەکرێت، لە ئوسترالیاو ئەڵمانیاو ڕوسیاوە بەردەوام هاوڕێکانم پەیوەندی دەکەن بۆ پێشکەش کردنی بانگهێشت نامە بۆ کار، بەڵام من نامەوێت ئێرە کەشوێنی یادگاری باوکم و دایکمە بەجێ بهێڵم، هەروەها ئازاری دایکیشم جاری زۆر تازەیە، ئەگەر پێویستم بەکار بوو ئەو کات خۆم پەیوەندیتان پێوە دەکەم.

بۆ مەسەلەی کچەکەشتان.. دایکم ئەوی زۆر خۆش دەویست تەنانەت وەکو کچی خۆی، منیش ڕێز بۆ ئەو خۆشەویستیەی دایکم دادەنێم و، ئەو وەکو خوشکی خۆم تەماشا دەکەم. بەدەر لەمە نیەتێکی ترم نییە.

ئەم وتانەی کۆتایی وەکو بۆمب لەناو ژوورەکەدا تەقیەوە هەمووان وەڵامی خۆیان وەرگرت، بەڵام ئەوەی بەتەواوی ڕووخا من بووم، هەموو ئومێدەکانم لەگەڵ زەوی تەخت بوون، بەڵام زۆر سەیر

بوو هێشتاش تروسکاییەك لە هیوا لەدڵمدا مابوو، باوکم بەو خۆبەگەورە زانین و بێ منەتیەوە ئەویشی پێ لەدەست دام.

لەدڵی خۆمدا ڕقم لەو جۆرو شێوازی قسەکردنەی باوکم دەبوەوە " ئاخ باوکە چی دەبوو بۆ یەك جار لەتەمەنتدا وازت لە خۆبەگەورەزانین و لووتبەرزی بهێنایایەو فێری شێوازی قسەکردن ببویتایە !

بۆیەك جار نرخی کەسی بەرامبەرت بزانیایە ! هەستت بەگرنگی شتەکانی تریش بکردایە، جگە لەپارە... ئاخ باوکە چی دەبوو؟!"

لەبەر ئەوەی قسەو باسەکان خەریك بوو کۆتاییان پێ دەهات، جەنابی پارێزگار هاتە قسەو وتی:

کاکی بەڕێز ئێوە گوێی مەدەنێ، من خۆم لەگەڵ مستەفا قسەدەکەم، هیوادارم قسەم نەشکێنێت و دوای چارەسەری کێشەکانی، بەدڵی خۆشەوە دەست بەکار بکات.

## لاشەیەکی بێ گیان بووم:

ئەوێمان بەجێ هێشت، بەڵام دڵم لەلاشەم و هۆشم لەسەرم جیابوو بوونەوە.. بیرم نییە هیچ کاتێك ئەوەندە بەڕووخاوی و نائومێدی خۆمم دی بێت! ئومێدو خەیاڵ و خۆشەویستیەکانم لەوێ جێ هێشت و بەبێگیان وەك جەنازە هاتمە دەر! ئیتر لاشەیەکی بێ گیان بووم! چەندین ڕۆژ نەهاتمەوە سەرخۆم، لەژوورەکەم دەرگام دادەخست و

شەو تا بەیانی دەگریام، لە حزووری خوادا چەندە فرمێسکم ڕشت...!

ئیتر بۆ من ڕۆژانێکی سەخت دەستی پێکردبوو نەمدەویست بگەڕێمەوە بۆ ئەو ژیانە دوو ڕوویی و دڵتەنگی و بێ ڕۆحەم بەلەدەست دانی مستەفاش کە هەموو ئومێدێکم بوو، ئیتر بەهەردوو دەست دەمویست ئیمان لەئامێز بگرم و لێی جیانەبمەوە چونکە جگە لە ئیمان دڵنەواییەکم بۆ نەمابووەوە.

ئەمە دوای ئەوەی ئەو هەواڵەشم بیست، کە جەنابی پارێزگار چەند جار مەسەلەکەی بە مستەفا وتوەتەوەو زۆری لێ کردووە، ئەویش بەرگەی نەگرتووەو لەبەر نەشکاندنی قسەی ئەو ئەو شارەی بەجێ هێشتووە، تاقیکردنەوەی ڕاستەقینەی من ئەو کاتە دەستی پێکرد. بۆ بەردەوامی دانم بە ژیان بێ مستەفا دوو هەڵبژاردنم لەبەردەمدا بوو: یان چوونەوە ژێر باری ئەو دنیا بێ ڕۆحەی کە هەموو شتێك بەپارە دەپێوێت، یاخود پێداگری لەسەر گەیشتن بەخودا و ئاسوودەیی ڕاستەقینەو لەو پێناوەشدا بەرگەگرتنی هەموو فشارێك... بۆ ئەوەی لەناو تەنیایی خۆمداو لەو دونیا تاریکەی تیایدا بووم نەخنکێم چەندین ڕۆژ لەخودا پاڕامەوە. ئەوەندە گریام و هاوارم کرد وەخت بوو ناخم پارچە پارچە دەبوو و تێك دەچووم. لەم گەشتە نوێیەمدا بەبێ مستەفا بەردەوام دەسوتام و داوام دەکرد کە ڕزگارکەرێك ڕابەرێکم پێ نیشان بدرێت کە جێگەی مستەفا پڕ

بكاتەوە چونكە لەوبارە قورسەی بەسەر شانمەوە بوو زۆر لاواز بوو بووم بەرگە گرتنم ئەستەم بوو، وەك درێژ كردنی دەستێكی یارمەتی بۆ كەسێكی تەنهای بەجێ ماو لەناو بیابانێكی چۆڵدا خوای مەزن دەرگایەكیشی بەمن نیشان دا...

ئەو ڕووداوە پڕ ڕازەتان چۆن بۆ باس بكەم ...نازانم... بۆ كەمێك دووركەوتنەوە لەخەمەكانم و سوك بوونی ئەو بارە قورسەی ژیان بەبێ مستەفا! لەكۆمپانیاكەی باوكم دەستم بەكاركردن كرد، لەسنوری كارەكەشمدا هەوڵم دەدا دەستی یارمەتی بۆ كەسانی لێقەوماوو هەژاری خەڵكی ئەنادۆڵ درێژ بكەم بەتایبەتیش دابین كردنی خەرجی خوێندن بۆ منداڵە هەژارەكانی ئەو شارانە لەنیەتمدا بوو.

بەڵێ هەموو شتێك لەو ئێوارەیەدا ڕوویدا، ئەو ئێوارەیە دەستپێكێكی نوێ بۆ ژیانم و خۆڕاگریەكی تازە لەتەمەنمدا و بیركردنەوە و فیكرێكی نوێ لە زەینمدا چرۆی دەكرد...

ئەو ئێوارەیە، لەگەڵ دایكم هەڵسەنگاندنمان بۆ ئەو ڕووداوانە دەكرد كە لەو كۆتاییانەدا تیایاندا ژیا بووین بەمانایەكی تر بەلێپرسینەوەی خۆمان، دانەدانە هەڵەكانمان دەهێنایەوە پێش چاو. لەم مەسەلانەدا دایكم لەباوكم بۆم نزیكتر بوو، باوكم بەهەموو جۆرێك لەباسی خواو پێغەمبەردا بەرپەرچی دەدایەوە.

## سامناکی قیامەت:

لەناو ژوورەکەمدا کە بەجوانترین کەل و پەل ڕازێنرابوەوەو لەسەر جێگە گەرمەکەم پاڵ کەوتبووم، لەزەینمدا وردەکاریەکانی پرۆژەی یارمەتیەکە بەهەزار جۆر دەهات و دەچوو، لەخشوعێکی زۆردا بەداواکردنی پەناو یارمەتی و هێز لە پەروەردگارم بۆ ئەو کارە خێرەی دەستم دابویە چاوەکانم داخست تا خۆم لەناو هاوارو ناڵەی خەڵکی شڵەژاوو ترساوی سەر شەقام و کۆڵانەکاندا دۆزیەوە کە هەموو هاواریان دەکرد" قیامەت هەڵدەستێت!" ئەو دوکەڵەی ئەو ناوەی پڕکردبوو، چاوەکانی کوێردەکرد، چەندە سوتێنەر بوو! بەو هاوارو ناڵانەی بەرز دەبویەوە گوێیەکان کپ وکەڕ دەبوون، تەلارەکان دەڕووخان و کێوەکان تاتاستی شەقامەکان تەخت دەبوون.

لەناو ئەو هەڵمە دۆزەخیەی هەموو جێیەکی گرتبوەوە کەس نەیدەزانی چی دەکات و بەرەو کوێ ڕادەکات، ئەو هاوارە تۆقێنەرانەش کە بەرزدەبوونەوە مرۆڤی پارچە پارچە دەکرد.

من و دایکم و باوکیشم کە هاتبووینە باڵکۆنی ڤێلاکەمان سەرنجی ئەو تابلۆ ترسناکەی دەورروبەری خۆمانمان دەداو لەبەرامبەریدا بەهاوارکردنەوە باوەشمان بەیەکدا کردبوو.

بەبەرچاومانەوە هەموو کۆمپانیاو کارگەکانی باوکم دەڕووخان پارەو چەك و بەڵگەکانی بەهەوادا دەچوون و دیار نەدەمان.

زۆری پێنەچوو لەسەر گردێکەوە شتێك وەکو ئەژدیهایەك هەموو ئەوەی خاوەنی بووین قوتی دا. ئێمە بەترسێکی زۆرەوە لەناو ئەو هات و هاوارەدا بەرەو قاتەکانی سەرەوە بەهاواری " خودایە یارمەتیمان بدە" ڕامان دەکرد باوکم کە بەدرێژایی ژیانی لەدژی دین و خوا وەستاوەو هیچ کات بچوکترین هەنگاوی بۆ نەناوە، هەردوو دەستی کردبوەوەو بەلالانەوەوە لەخۆی دەدا:" خوایە جگە لەتۆ هیچ دۆست و ڕزگارکەرێکی تر نیە، بەتەنها تۆ دەتوانیت یارمەتیمان بدەیت!"

دایکیشم هاواری بەرگەی نەدەگیرا:

" تۆ کە چارەی بێ چارەکانیت تۆ ڕێگە نیشانی سەرلێشێواوەکان دەدەیت.. یارمەتی دەردەدارەکان دەدەیت ڕزگارمان بکە خودایە..."

بەئومێدو بڕوایەکی زۆرەوە لەوترس و تۆقانەی تیایدا مابووین لەهەر ساتێکدا چاوەڕێ بووین مەرگ یەخەمان بگرێت، ئەوە یەکەمجار بوو لەژیانمدا هەستم بەبەرکەوتنی ساردی فریشتەی گیان کێشان ئیزرائیل دەکرد کە بە خوێن و گیان و دەروونمدا دەڕۆیشت، ئەو ترسەم لە فریشتەیەك نەبوو، بەڵکو لەبەر گوناهباریم بوو.

لەبەر ئەوە تا دەنگم دەربهاتایە هاوارم دەکرد:

- پەروەردگارم! من بەندەیەکی شیاوی تۆ نیم، بەلام تۆم زۆر خۆش دەوێت، ئەو بەندە خۆشەویستانەی تۆشم خۆش ویست، ئەگەر

لەبەر خاتری ئەوانیش بێت، کەمێکی تر تەمەنم پێ ببەخشە تاکو بۆ گوناهەکانم تەوبە بکەم و لەبەر ڕەزامەندی تۆ کاری خێر ئەنجام بدەم، لەوبێ چارەییەدا کە لەسەرمانەوە تا پێکانمان لەئارەقی ترس و بیمی خۆماندا نقوم بوو بووین خۆمان بۆ تەسلیم کردن بەمەرگ ئامادە کرد بوو. لەناکاو لەئاسمانەوە ئامێرێکی فڕیو دەرکەوت، نازانم چۆن وەسفی بکەم تا بلێی سپی....لەفڕۆکە و کۆپتەر و هیچ یەکێکی تر لەو ئامرازە فڕیوانە نەدەچوو کە دەیانناسین، وەکو باڵندەیەکی سەرنج ڕاکێشی گەورە لە ئاسمانەوە بەئەسپایی دادەبەزی.

بەتەواوی هاتە سەرسەری ئێمە و بەهەوادا هەڵواسرا بوو دوو گەنجی خوێن گەرم لەناو دەرگاکەیدا دەردەکەوتن کە گوریسەکانی دەستیان فڕێ دەدایە خوارەوەو دانە دانە ئێمەیان بۆ ناو ئامێرە فڕیوەکە ڕادەکێشا لەگەڵ دایکم کە ڕۆیشتینە ناو ئامێرەکەوە، خوایە ئەوە کوێ بوو! پڕ بوو لە هەموو جوانیەك...ئەو دوو کەسەش کە پێشوازیان لێ کردین، لەجوانیەکی ئەفسوناویدا بوون، لەسەرنج ڕاکێشی و ڕەونەقێکی هۆش بەردا بوون کە مرۆڤی مەست دەکرد.

کاتێك نۆرەی باوکم هات بۆ گەیشتنە ناو ئامێرەکە لەناکاو ئامێرەکە بەرز بووەوە بۆ ناو هەواو دەرفەت بە سەرکەوتنی باوکم نەدرا، زۆر پاڕایەوەو هاواری کرد " منیش ئیمانم هێنا، منیش بەرن! " بەڵام زۆری پێ نەچوو لەناو دووکەڵ و تەمەکاندا لەچاو ون

بوو، لەگەڵ دایکم زۆر گریاین و داوامان کرد کە باوکیشم سەرکەوێت بەڵام یەکێك لەو گەنجە پڕ ڕازانە وتی:

- لەخۆڕا خۆتان ماندوو مەکەن، ئەم ئامێرە یەکێکە لە ئۆتومبیلەکانی بەهەشت، تەنها دۆستەکانی خوا دەتوانن سواری ئەمە ببن.

یەکسەر لەو کاتەدا ئومێدێکی گەورە لەدڵمدا دروست بوو " واتە خوای مەزن ئێمەی بەدۆستی خۆی داناوە! "، گەنجەکەی تەنیشتم وەك ئەوەی ئاگاداری چرکە بەچرکەی ئەوانە بێت کە بەخەیاڵمدا دەهاتن ئاوڕی دایەوە بەلامدا:

- ئێوە لەبەر کردەوەکانی خۆتان نا، بەڵکو لەبەر دوعای خۆشەویستەکانی خوا کە بۆ ئێوەیان کردووە ڕزگارتان بووە.

بەپەرۆشەوە پرسیم :

- کێ دوعای بۆ ئێمە کردووە.

- وەرن بتان بەمە لای ئەوان.

## ئەوەی ڕزگاری کردین، کێ بوو؟

بە ڕێگەیەکی تەسك و تاریك و دەرچەیەکی پڕ زەحمەتتدا ڕۆیشتین تا گەیشتینە بەر دەرگایەکی سەرنج ڕاکێش و وەستاین وتی:

- بچنە ژوورەوە، چاوەڕێتانن.

ئای خوایە گیـان! باخچـەیەکی ئەوەنـدە نـەبڕاوەو دڵـڕفێن بـوو، ئەوەنـــدە سەرســـامکەر بـــوو، هـــەموو هەســـتەکانی مرۆڤـــی دەجوڵاند...لەناوەڕاستیدا کۆشـکێکی گـەورە هـەبوو کـە تـا دڵ حـەز بکات ڕازێنرابووەوە بەهەموو جوانیەك، ئـەو ڤێللایـەی ئێمـە کـە لـەناو هەمواندا ناسـرا بـوو، لەچـاو ئێـرەدا تـەنها هێلانەیـەکی بچـوك بـوو، لەحەپەسان و پەرۆشیدا لەبەر خۆمەوە وتم: " دەبێت ئێرە بەهەشت بێت"...

چـــەند مـــەترێك لـــەو دیـــوو کۆشـــکەکەوە جێیـــەکی دانیشـــتن ئامـــادەکرابوو کـــە تیایـــدا دوو مـــرۆڤ دانیشـــت بـــوون پرشـــنگیان لەدووریـەکی زۆرەوە دەدرەوشـایەوە، پـاش تەماشـایەکی زۆر تـوانیم بیان ناسمەوە کە مستەفاو پوورە فاطمە بوون.

بەڕادەیەك سەرم سـوڕما بـوو کـە خـەریك بـوو لـەهۆش دەچـووم، ڕووی درەوشـاوەی ئـەو دایـك و کـوڕە و خۆشـحاڵی لەڕادەبـەدەریان ئەوەندە ئێمەشی هەستیار کردبوو کە ئێرەییمان پێدەبردن...

ئێمەیان لە شوێنێکی تایبەت دانیشاند و خۆشیان لەو ساباتەی کە چەند مەترێك لەسەرو ئێمەوە بوو بە ڕووخۆشـیەکی زۆرەوە دانیشـتن و تەماشای ئێمەیان دەکرد.

دایك و کچیش لەو تابلۆ وەصف نەکراوەدا تەواو خۆمان لەدەست دابوو، بێدەنگ و حەپەساو مابووین.. بەڵام حەسرەتی باوکیشم لەدڵ دەرنەدەچوو دایکیشم فرمێسکی دەڕشت و دەیوت: "ئێستا باوکیشت

لێره بوایه! " باوکم که لەدنیاش نەیهێشت ئاسووده بین، لێرەش تەنانەت دەبێت خەفەتی لێ بخۆین...

ئەوەی وەکو خزمەتکار هاته لامان و میوانداریەکی باشی لێکردین وتی:

– بەڵێ ئەم دایك و کوڕه زۆریان دوعا بۆ کردن، بەتایبەت مستەفا بۆ هیدایەت وەرگرتننتان زۆر پاڕایەوه ئەوان ئێوه دەبینن و دەنگتان دەبیستن، بەڵام ئێوه قسەکانی ئەوان نابیستن.

دەستم کرد بەپاڕانەوه که ئەگەر یەك وشەش بێت دەمەوێت قسه لەگەڵ مستەفا بکەم، بۆیه بەو کەسەی میوانداری دەکردین وتم:

– چی دەبێت ڕێگەیەکم نیشان بدەن تا بەجۆرێك قسەمان لەگەڵ بکەن! لانی کەم سوپاسیان بکەین لەبەرئەوەی ئێمەیان ڕزگار کردووه....

ئەو کەسه ئەفسوناوییه:

– دەچم پێیان دەڵێم..

نوشتایەوه چرپەیەکی بەگوێی مستەفادا کرد، لەدوای ئەوه وەك ئەوەی پێشتر ڕێگرێك هەبووبێت و ئێستا نەما بێت، له دووریەکەوه دەنگی مستەفام ناسیەوه که وتی:

– بەخێر هاتن...

ئێمەش یەکسەر وەڵامماندایەوه:

– خوا لێتان ڕازی بێت. ئەگەر یارمەتیتان نەدایناپە ئەو گەردەلوولی دنیایە کە لە قیامەت دەچوو ئێمەشی قوت دەدا و ڕزگارمان نەدەبوو، بەڵام باوکم نەهات.

مستەفا وتی:

– زۆر خەمبارم بۆ ئەوە بەڵام خوا شانسێکی تری بۆ ئێوە نارد ئەگەر ئەم هەلە بەکاربهێنن و ببنە بەندەیەکی شیاوی ئەو سەرەنجامتان ئاوا دەبێت، دەبێت حاڵی باوکت بۆ ئێوە ببێتە پەند.

دایکم بەپەرۆشیەکەوە وتی:

– هاوسەرەکەم هیچ شانسێکی نییە؟

– ئەوەی کە دیوتانە بۆ ئەویشی باس بکەن ئومێد دەکەم ئەو خوایە بدۆزێتەوە کە ئەوی ناردۆتە دنیاو هەر ئەویش لەدنیا دەری دەکات بەڵکو ئەمە بەجدی وەربگرێت و ئامادەکاری بۆ دوا ڕۆژی بکات.

دایکم پرسی:

– ئەی ئێمە چی بکەین؟ لەکوێوە دەست پێ بکەین؟

– خوای مەزن چی لە ئێوە بووێت....

– واتە؟

مستەفا لەوەڵامی ئەمەدا سەری ڕاوەشاند:

– تەمەنتان بەخۆڕایی تێپەڕاند پێکەنینتان بەو کەسانە دەهات کەبەندەی باشی خوا بوون، دوژمنی قورئان و ئیمان بوون، بەڵام

پەروەردگارم ئەوەندە میهرەبانە، بچوکترین پەشیمانی ناو دڵەکان دەکاتە وەسیلەی ڕزگار بوون بۆیان.

دایکم ئیلکای خانی زۆر خۆش ویست تەنها بە دوعا کردنەکانی خۆیشی لێ نەگەڕا، بەڵکو داوای لەمنیش دەکرد لە نوێژەکاندا دوعای بۆ بکەم، بەهۆی دوعا بەکوڵەکانی دایکمەوە خوای گەورە شانسێکی تری بەئێوە بەخشی .

– تکا دەکەم بەرچاو ڕوونیمان پێ بدەن!

– ژیانێکی شیاو بەبەندایەتی خوا، دۆزینەوەی گروپی ئەو هاوڕێیانەی کە لەپێناو بەدەستهێنانی ڕەزامەندی خوادا کاردەکەن، قەزا کردنی ئەو پەرستشانەی کە نەتان کردوون....

هەموو ئەمانەم لەبەر کرد، دواتر پرسیم:

– باشە کێ یارمەتی ئێمە دەدات.

وتی:

– بچنە لای فریشتە خان.

– فریشتە خان کێیە؟

– ئەو ئێوە دەدۆزێتەوە.

بەدەنگە دەنگێکی زۆر بەئاگا هاتم، زەمین لەرزە بوو، ڤێللاکان بەو گەورەییە لە شوێنی خۆیان دەلەرزینەوە زۆر ترسناك بوو، هەموان خۆیان گەیاندە باخچەکەی دەرەوە، وەك بڵێی ئەمە سەرەتای ئەو ڕووداوانە بوو کە لە خەونەکەمدا دی بووم، سەیر ئەوە

بوو من و دایکم و خزمەتکارەکان و تەنانەت باوکیشم لەو کاتەدا تەنها هاواری خوامان دەکرد.

دایکم نەیدەتوانی هێور ببێتەوە.

– دایکــە بەســە... تــەواو بــوو ئــیتر... دەمویســت بیوەســتێنم، نەدەکرا...

– چۆن ئـارام بم کچـم، ئەمـەم بەتـەواوی لەخەونـدا بینـی، سـەیری چاوەکانی دایکم کرد، وەك ئەوەی بۆمبای پیا تـەقی بێـت چـاوەکانی سوور بوو بوون، ڕوخساری تەواو تێکچـوو بـوو، وەکـو شـێت هـاواری دەکرد:" فریشتە خان، فریشتە خان.."

وتم:

– دایکە کام فریشتە خانە!

– ئەو خانمەی ئێمە ڕزگار دەکات....

ئـای خوایـە گیـان ...بـێ هـۆش بـووم لەوێدا...دایکیشـم هـەمان خەونی بینیوە. باوکیشـم دووبـارە پێکـەنینی بـە ئێمـە دەهـات، ئـەم شتانە لەدنیای ئەودا جێی نەدەبوەوە تەنها شت کە باوەڕی پێ هێنـا بوو پارەو هێز بوو.

## نەخشە ڕێگاو یەکەمین سوجدەم:

ئەو شەوە لەگەڵ دایکم نەخشە ڕێگەیەکمان دیاری کرد:

١– ژیانێك کە شیاوی ڕەزامەندی خوا بێت.

٢- گروپی ئەو هاوڕێیانەی کە بۆ خوا دەژین.

٣- یارمەتی دانی بێ کەس و هەژارەکان.

ئەو ئێوارەیە یەکەمین هەنگاو بوو بەرەو ژیانێکی بۆ خوا بوون، لەکاتێکدا باوکم و هاوڕێکانی لەسەر مێزی خواردنەوە دەنگی پێکەنینیان بەرزدەبوەوە، من و دایکم بۆ یەکەمین نوێژمان لە حزووری پەروەردگار ڕاوەستاین.

ئای خودایە! لەو ئێوارەیە..! یەکەمین تەکبیر.. یەکەمین ڕاوەستان.. یەکەمین سوجدە..

ئەو ئێوارەیە ڕۆحم تیایدا فڕی و دڵم لەجێی خۆی هەڵکەندراو جەستەم لەڕاستەقینەترین عەشقدا توایەوە....

ئەو ئێوارەیە ساتێك بوو کە هەستمان بە ڕاستەقینەترین ئاسوودەیی دەکرد و واماندەزانی تازە لەدایك بووینەتەوە.

ئەو شەوە بۆ یەکەمین جار قیبلەمان ناسی و ڕوومان کردە خواو بەشداری ئەو کەشە مەعنەویە جوانەمان کرد کە بەندە ڕاستگۆکانی خوا تیایدا دەژین چۆن باسی بکەم پەروەردگارم؟!

ئەو شەوە تا بەیانی بەبێ وەستان فرمێسك لەچاوم دەباری لەبەر هەڵەو تاوانەکانم تا توانیم داوای لێخۆش بوون و سڕینەوەی هەڵەکانم لە زاتی حەق کرد.

ئەو شەوە تەمەنی گوناهباری ئیلکای کۆتایی پێ هات. لەژیانی تازەشمدا بە بەڵێنی جیانەبوونەوەم لە ڕێبازی خوا دەستم پێ کرد،

بەدرێژایی تاریکایی ئەو شەوە داوام کرد خوا بەبەندەیەکی شیاوی خۆی قبولم بکات وەکو دوا دوعاشم لەبەیانیدا لە قووڵایی دەروونمەوە پاڕامەوە " پەروەردگارم ئەگەر بۆ یەك ساتیش لەم کەشە ڕۆحانیانە دابڕام، ئیتر مەمژێنە !..."

هەر کە ڕۆژ بووەوە یەکەمین شت کە لەژیانی نوێماندا پێی هەستاین، لەگەڵ دایکم پۆشینی جل و بەرگی گونجاو بەو ژیانەمان بوو، بۆئەمەش زۆر ناڕەحەتیم بەدەست باوکمەوە چەشت، بەڵام ئیتر من جگە لە خودا گوێم بۆ کەسێکی تر نەدەگرت، کاتێك بەسەرپۆشەکەی سەرمەوە بۆ یەکەمین جار چوومە بەردەمی ئاوێنەکەم، بەئەسرینی چاوەکانمەوە بەڵێنم دا " ئەم سەرپۆشە شایەتی ئیمانەکەم بێت، دەبێت بەردەوام بەم پۆشاکەوە بڕۆمە دەر، ئیتر ئەمە دەبێتە ناموس و نیشانەی ئیمانی من"

ئەو ڕۆژە فەلسەفەیەکی نەگۆڕم بۆ ژیانم دانا، سەرەتا دەبێت خۆم پەروەردە بکەم پاشان پێویستە ببمە ژنە بازرگانێکی بەهێزو، هەموو ئەوەی دەستم دەکەوێت بەسەر لێقەوماو و قوتابییە هەژارەکاندا دابەشی بکەم.

زۆر بەتایبەتیش دەبێت قوتابخانە و جێگەی پێویست بۆ پێگەیاندنی گەنجانی ئیماندار و نیشتمان پەروەر بکەمەوە، هەموو ئەوەی کە دێتە دەستم دەبێت بیکەمە وەقفی ئەم یارمەتی و خزمەتانە.

بەڵام لەم نەخشە ڕێگە نوێیەمدا، چاوم لەو ڕێگەیەش بوو کە مەلەك خان بۆم دیاری دەکات، ئەو کێیە؟ لەکوێیەو چۆن دەردەکەوێت؟ چ ڕێگەیەکمان نیشان دەدات؟ بەردەوام بیرم لەوە دەکردەوە.

لەگەڵ ئەو خانمە دۆستانەی کە لەکۆتایی هەفتەکاندا دانیشتمان هەبوو بۆ گفتوگۆ کردن لەسەر بابەتە ئیمانیەکان و وەرگرتنی زانیاری پێویست بۆ برەودان بە بەندایەتی و پەرستشەکانمان، بەم جۆرە بەبیرکردنەوەیەکی قووڵەوە هەوڵمان دەدا لەخۆمان و دینەکەمان تێ بگەین، ئەوەندە لەم گفتوگۆیانەدا قاڵ دەبوومەوە کە بەپێی ئەو زانیاریانەی لەوێ فێر دەبووم، ڕۆژانە لەکاتی دیاریکراودا جێبەجێم دەکردن.

ئاشکرایە تا ئێستا لەبۆشایی و کەلێنی گەورەدا ژیاوم و بەخۆشم نەزانیوە...ئاه باوکە چیت پێ بڵێم، نازانم...بەتەنها نەتکردینە بەندەی پارە، بەڵکو بەدوور خستنەوەمان لەدین ئێمەت کردبووە لاشەیەکی بەشان و شەوکەتی ناو بۆشی ڕۆح لاواز.

دووبارە کۆتایی هەفتە هاتبوو، بەفڕین بەرەو ئەو گفتوگۆیە ڕام کرد کە بانگهێشتیان کردبووم، لەکۆمەڵەکەدا دوو پزیشك و چەند ژنە بازرگانێك و چەندین کەسی تری خاوەن ئیشی جۆراو جۆر ئامادە بوون.

ئەوەندە کاریگەر بووم بەو گفتوگۆیانە.. لەزیرەکی و لێهاتوویی ئەوانە شەرمەزار دەبووم کە پێشتر واتێگەیاندرا بووین موسوڵمانەکان، کەسانی نەفام و نەزانن.. ئەوانەی لەوێ ئامادەبوون، هەریەکەو لەبواری خۆیدا کەسی پێگەیشتووبوو ئەمەش دنیابینی منی تەواو گۆڕی بوو.

من کێم؟ بۆ دەژیم و هۆکاری بوونم چییە؟ ژیانی دووەمی کەسانی مردوو چییە؟ یاساکانی ئیسلام بۆ ژیان چین؟ ئەی حیکمەت و دانایییە شاراوەکانی چین؟ سەدان پرسیاری لەو جۆرە لەسەرمدا گوزەریان دەکرد. بەلادانی ئەم پەردانە لەسەر چاوم هەستم دەکرد لەپێویستی ئەوەدام زانستێك بزانم کە ڕێگەیەکم بەرەو ئاخیرەت بۆ ڕووناك بکاتەوە....

بەڵێ هەر لەم کۆمەڵانەی تیایاندا دادەنیشتین بەشێوەیەکی سەرنج ڕاکێش و بە ئەدایەکی جوان وەڵامی دانەدانەی ئەمانەم پێ دەگەیشت... ئاه مستەفاکەم! چەندە قەرزاری تۆم... تۆ بەتەنها خۆشەویستی و عەشقی دنیاییم نەبوویت، تۆ خضرێك بوویت کە ڕێچکەی ئاخیرەتیشت نیشان دام، بەخۆشویستنی تۆ هەموو ئەم جوانیانەم دۆزیەوە تەنها خۆشەویستی خۆت نا، بەڵکو عەشقی خوات پێ ئاشنا کردم.

چۆن سوپاس گوزارت بم، نازانم! ئاه ئێستا لێرە بوویتایە لەلام بوویتایە هەموو تەمەنم پێ ببەخشیتایە. بەتێپەڕ بوونی ڕۆژ لەبەر

چـاوم گـەورەتر دەبیـت، ژیـان بینـی تـۆ هـەموو ڕۆژێـك باشـتر لەبیرکردنـەوەکانی منیشـدا ڕەنـگ دەداتـەوە. چـی دەبێـت، ڕۆژێـك دەرکەوە. ئەو دڵە ساف و خاوێنەت بابتوانێت لە هەست و سۆزەکانی مـن تـێ بگـات، وەرەو دەسـتم بگـرە تـاکو لەسـایەی تـۆدا بتـوانم بەمتمانەیەکی زیاترەوە لەسەر ئەم ڕێگەیەی پەروەردگارم ڕێ بکەم.

## گوناهەکان دڵ دەمرێنن و، مرۆڤ دڵتەنگ دەکەن:

ئەو ڕۆژە لەباسێکدا بووین کە پێش گفتوگۆکە دیاری کرابوو شەرم و شکۆو نەزەرکردن، بەکورتیەکەی (عیففەت) داوێن پاکی، باسی ئـەو ڕۆژەمان بوو.

لەڕاستیدا ئەم باسە جێی گرنگی پێدانی منیش بوو، چونکە من لە کلتورێکـەوە هـاتبووم کـە هیچـم لەسـەر ئـەم بابەتـە نـەدەزانی و لەژیانێکی پڕ سەربەستیدا هەستم بەهیچ هەستیارییەکی ئـەم باسـایە نەدەکرد.

لەو کۆمەڵگەیەی من لێوەی هاتبووم، گەنجەکان پێویست بـوو بـۆ ژیانیان یەك بناسن و بچنە دەرەوەو پیاسە بکـەن پێکـەوەو... بـەڵام ڕوانینـە ئیسـلامیەکانی ئـەم ژیانـە نوێیـەمم نـەدەزانی لـەڕووی ئـەم بابەتەوە... لەبەر ئەوە باسی ئەو ڕۆژە زۆر بۆم گرنگ بـوو. یەکـەمین جار بوو تێڕوانینە ئیسلامیەکان سەبارەت بـەم باسـە ببیسـتم... ئـەو ماڵەی وانەکەمان لێ دەخوێند بەدیکۆری عوسمانیـەکان ڕازێنرابـوەوە

که لەوپەڕی جوانیدا بوو لەسەر دیوارەکانی تابلۆ و نووسینی زۆر جوان نەخشێنرابوون بەجۆرێك مرۆڤی سەرسام دەکرد، لەژوورەوە کەسێکی ئەوەندە ئارام دانیشتبوو، کە هەر بەیەکەم هەنگاونان بەرەو ژوورەوە هەستت بە هەڵمژینی هەوایەك دەکرد کە ڕۆح پێویستیەتی.... خانمێکی ڕووخۆش و دەروون پاك کە بەهەڵسوکەوتە شیرینەکانی ناخی مرۆڤی فەتح دەکرد، خاوەنی ئەو ماڵە بوو. خۆی مامۆستای پەروەردەیی و هاوسەرەکەشی لەکارگە کاری دەکرد. هەر لەگەڵ چوونە ژوورەوەم بەپێشوازییەکی گەرم و لەئامێزگرتنێکی دایکانەی پڕ لەمیهرەبانی فەرمووی کردم بۆ دانیشتن. لەپشت سەرمەوە کتێبخانەیەکی ڕازاوە بەچەندین کتێبی دینی و زانستی هەبوو کە سەرنج ڕاکێشترینیان تەفسیرێکی قورئان بوو لەناو بەرگێکی ڕەنگ سووردا.

لەدوای یەکترناسینێکی خوشکانە ئەو خانمەی بەرپرسیار بوو لەباسی ئەو ڕۆژە دەستی بە قسەکانی کرد:

– وانەکەی ئەمڕۆمان باسێکی زۆر جددیی و گرنگە لەلایەنی کۆمەڵگەو مرۆڤایەتییەوە" عیففەت (داوێن پاکی) و زینای چاو"ە... ئەم باسە هەستیارەی کە ڕەنگە لای زۆربەی موسوڵمانان فەرامۆش کراو و لەبیر چوەوە بێت، نەخۆشیەکی کاریگەرە لەسەر هەموو لایەنێکی ژیانی مرۆڤ.

بەر لەباسی "زینای چاو" وەکو ئامادەکارییەك بۆ ئەو باسە سەرەتا بابەتی "بێ شەرم و شکۆیی" باس دەکەین، چونکە بێ شەرمییەکە زینای چاویش دێنێتە کایەوە، بەداخەوە ئەمڕۆ زینای چاو بۆتە بەڵایەك کە خۆمان و هاوسەرەکانیشمان بەردەوام دەترسێنێت.

عیففەت چییە؟سەرەتا بەڕوونکردنەوەی ئەمە دەچینە باسەکەوە:

زاراوەی عیففەت بەواتای: ئەدەب، حەیا، ڕاکردن لە حەرام، ترسان لەتووش بوون بەگوناه... دێت کە یەکێکە لەگرنگترین خەسڵەتەکانی موسوڵمانی ڕاستگۆ.

خوای مەزن بۆ بەردەوامی دان بەنەوەی مرۆڤ، کچ و کوڕی بەرامبەر بەیەك ورووژێنەرو یەکتر ڕاکێشەر دروست کردووە، لەهەمان کاتدا بەرامبەر ئەم هەستە بەهێزە مرۆڤی لەتاقیکردنەوەیەکی سەختدا کۆکردوەتەوە، لەتەمەنی کورتی دنیاییماندا تاقیکردنەوەی عیففەتی کردۆتە سەختترین باری تاقیکردنەوەکان، بێگومان ئەوەی لەدواڕۆژدا بە براوەی ئەم تاقیکردنەوەیە دەربچێت! ئەوا بۆتە قارەمانی هەردوو دنیا، خوای مەزن لە قورئانی پیرۆزدا لەچەندین جێگەدا خاوەن عیففەتەکانی بەبراوەی چەندەها پلەی بەرز وەسف کردووەو بێ شەرم و حەرامکارەکانیشی بەسزای دۆزەخ ئاگادارکردۆتەوە. لەوەسفی ئیمانداراندا خوای گەورە فەرموویەتی:

﴿قَدْ أَفْلَحَ الْمُؤْمِنُونَ* الَّذِينَ هُمْ فِي صَلَاتِهِمْ خَاشِعُونَ* وَالَّذِينَ هُمْ عَنِ

اللَّغْوِ مُعْرِضُونَ* وَالَّذِينَ هُمْ لِلزَّكَاةِ فَاعِلُونَ* وَالَّذِينَ هُمْ لِفُرُوجِهِمْ حَافِظُونَ* إِلَّا عَلَى أَزْوَاجِهِمْ أَوْ مَا مَلَكَتْ أَيْمَانُهُمْ فَإِنَّهُمْ غَيْرُ مَلُومِينَ* فَمَنِ ابْتَغَى وَرَاء ذَلِكَ فَأُوْلَئِكَ هُمُ الْعَادُونَ﴾المؤمنون:١-٧.

واته: "بەڕاستی خاوەن باوەڕەکان ڕزگاریان بووە، ئەو خاوەن باوەڕانەی کە لە نوێژەکانیانا لەخواترس وئارامن، کە لەگوتارو کرداری بێ سوودیش خۆیان لائەدەن، کە زەکاتی ماڵی خۆشیان دەرئەکەن، کە عەورەتی بەرودوای خۆشیان دەپارێزن. تەنها بۆ هاوسەری شەرعیی خۆیان یان کەنیزەکیان نەبێ کە بەگوێرەی شەرع بووبن بە هیی ئەوان، بەڕاستی ئەوانە لۆمەیان ناکرێ ئەگەر بچنە لای ئەو جۆرەکەسانە. دەی کەسانێ بەدوای لەو دوو ڕێگا شەرعییەی پێوەندی نێوان پیاوو ئافرەت بەولاوە بکەون، ئەوانە یەجگار زۆر دەسدرێژییان کردووە. "

کەسی بەعیففەت لەهەمان کاتدا خاوەنی شەرم و حەیایە، واتە لەگوناهکردن شەرم دەکات و ڕادەکات.

لەم باسەشدا چەندین فەرموودەی پیرۆز و وتەی بەنرخ هەن:

* شەرم و حەیا لە باوەڕەوەیە. (بوخاری)

* ئەوەی حەیای نەبێت، ئیمانیشی نابێت مرۆڤی بێ ئیمانیش ناچێتە بەهەشتەوە (دەیلەمی).

* کەم حەیایی لەکوفرەوەیە (حاکیم).

عیففەت واتە ناموس، تا چەندە گرنگ بێت کەم شەرمی و کەم ناموسیش ئەوەندە خراپ و مەترسیدارە، لەباسی ناموسیشدا چەند فەرموودەیەکی پیرۆز هەن.

* باش بزانن، بۆ ئەوانەی ناموسیان دەپارێزن بەهەشت هەیە. (حاکیم)

* ئەو موسوڵمانەی خۆی لە زینا دەپارێزێت، دەچێتە بەهەشت. (بەیهەقی)

* بۆ ئەوەی لەخراپەکاری پارێزراو بن، بەخێزانداری و عیففەتەوە بژین .(ابن عساکر)

* ئەوەی خێزانی کەسێك لەرێ دەربکات (لەرێ لای بدات) لەئێمە نییە. (حاکم، احمد ابن حنبل)

* هەر ژنێك پێنج نوێژەکەی ئەنجام بدات و ناموسی بپارێزێت و، گوێڕایەڵی هاوسەرەکەی بێت، دەچێتە بەهەشتەوە لەو دەرگایەی کە خۆی بیەوێت.( ابن حبّان)

* ئەوەی ئەم شەش شتە بەجێ بهێنێت، دەبمە کەفیلی چوونە بەهەشتی: ئەو کەسەی لەگوفتاردا ڕاستگۆ بێت، بەڵێنەکانی جێ بەجێ بکات، پارێزگاری لەئەمانەت بکات، ناموسی بپارێزێت، چاوەکانی لەحەرام لادات و دەستی لە خراپە بگەڕێنێتەوە. (احمد ابن حنبل)

وەك لەفەرموودەكاندا ئاماژەی پێ كراوە، ئافرەتان زیاتر لەپیاوان لەپێویستی شەرم و حەیادان، ئەگەر وانەبوایە ڕەفتاری زۆر پیس و نەشیاو بڵاودەبویەوە، ئەوەتا دوژمنەكانی دین كە ئاگاداری ئەمەن هەر لە منداڵیەوە هەوڵی ئەوە دەدەن كە شەرم لە كچەكانمان داماڵن و كۆمەڵگایەكی چاوبرسی و دوور لەحەیا بهێننە كایەوە هەر بۆیە ئافرەتی موسوڵمان پێویستە لەخەمی شەرم و حەیاكەیدا بێت.

ئەم بابەتە لەفەرموودەكاندا بەم جۆرە ڕەنگی داوەتەوە:

- حەیا جوانە، بەڵام لەئافرەتدا زۆر جوانترە(دەیلەمی)

عیففەت لەكچێكی گەنجدا یان هەر ئافرەتێكدا نرخەكەی گەوهەرێكە كە بە پارە مەزەندە ناكرێت، هەر كوڕێك كە لە خوای خۆی نەترسێت، هەموو شەیتانیەتی خۆی بەكاردەهێنێت بۆ دەست كەوتنی ئەو گەوهەرە. دەبێت زۆر سەرنجی ئەمە بدەین چونكە كە عیففەت و شەرم نەما، زینای چاو دەست پێ دەكات كە ئەویش سەرەنجامەكەی دیار نیە لە كوێدا دەوەستێتەوە. ئەگەر پارێزگاری نەگیرێتەبەر، كۆمەڵگاكەمان لە بنچینەوە هەڵدەوەشێت، هەر وتەیەكی ئەو خانمە وەكو بۆمبایەك لەمێشكمدا دەتەقیەوەو پارچەكانی بەر ئەو گوناهانەم دەكەوت كە لە ڕابردوودا ئەنجامم دابوون.. ئەو خانمەش كە بەرگەی ئەم وتانەی نەگرت و بەگریانە بەرزەكانی كەشێكی خەماوی لە ژوورەكەدا دروست كردبوو، منیشی پەرێشان كردبوو لەڕاستیدا ئەوەی دەگریا تەنها ئەو نەبوو، بەهۆی

ئەو گوناهە زۆرانەمەوە کە وەکو خەنجەر دەروونمی پارچە پارچە دەکرد، ئەگەر لەبەر شەرم کردنم لەو کەسانە نەبوایە، وەکو منداڵ هەر لەوێدا دەکەوتمە سەر زەوی و بەگریان خۆمم خاڵی دەکردەوە.
پوختەی باسەکە ئەوە بوو کە هەر دەبێت تاقیکردنەوەی "عیففەت" کە لەم ڕۆژگارەماندا زۆر بەرجەستەیە ببەینەوە، ڕەنگە لەبەر ئەمە بوو بێت کە مستەفام زۆر خۆشویست بوو، چونکە ئەو قارەمانێکی عیففەت بوو، هەرگیز نەدەکەوتە ئەو هەڵەیەی بە"زینای چاو" ناسراوە.
ئەو ڕۆژە دیدێکی نوێم بۆ دروست بوو، بڕیارم دا کە دەبێت ئیتر ژیانێکی پاك و ئارام و هەڵهاتوو لەحەرام بەسەر بەرم و ڕێگەم لەگەڵ ئەو کوڕانەی دەمناسین جیابکەمەوە. لەدوای ئەو پەرۆشییە زۆرەی گفتوگۆی ئەو ڕۆژە پێی بەخشیم گەڕامەوە ماڵەوە ڕۆشتمە بەر ئاوێنەکەم و پەنجەم بۆ چاوەکانم درێژ کردو بەخۆمم وت:
– ئەم دەورووبەرو دۆستانەت بۆ تۆ هەڵێکن کە دەبێت نرخیان باش بزانیت، ئەگەر نا دەکەویتەوە ناو هاوڕێ خراپەکان و بێ شەرمی و کەم حەیایی خەجاڵەتبارو داڕزاوت دەکات، ڕەنگە پەروەردگار لەهەر کاتێکدا کەسێکی نموونەیت بۆ بنێرێت... دەبێت خۆپارێزی بکەیت و نرخی ئەو دۆستانەت بزانیت!"، ئەم بیرکردنەوەیەم لە مێشك و دەروونمدا دەنگی دەدایەوە:

بەعیففەت بوون! ئیتر دەبوو خۆم دوور بگرم لە زینای چاو کە دڵ

دەمرێنێت...

# بەشی سێیەم

## ئەو فریشتەیەی چاوەڕێم دەکرد سەرسامی کردم



### خۆم بۆ خزمەت و چاکە یەکلایی کردبووەوە:

مانگ تێدەپەڕی بەڵام من ئەو هەواڵە خۆشەی چاوەڕێی بووم پێم نەدەگەیشت، نە لە فریشتەو نە لە مستەفاوە کەمترین نیشانە دەرنەدەکەوت، بەڵام زانینی ئەوەی کە مستەفا لە ژیاندا ماوە بۆ من بەس بوو، نازانم بۆ هەموو کات هەستم بەدەرکەوتنی سێبەرەکەی دەکرد لە پشتمەوە!

بەم سۆزو حەسرەتەوە دوو ساڵم تێپەڕاند، لەدەورو بەرەکەی خۆمدا بوو بوومە ژنە بازرگانێکی باش، دۆستی تازەو هاوەڵی تازەو دەوروبەری تازە....

باوکم چەندە بەرەنگارم ببوایەتەوە، من دەمتوانی لەسەر پێی خۆم ڕابوەستم... لەم ماوەیەدا دەیان گەنج دەهاتنە ماڵمان و داوایان دەکرد ببمە هاوبەشی ژیانیان، بە ڕێزو هەست بەرزییەوە دەرگاکەم نیشانی یەکەیەکەیان دەدا. ئەوان نەیان دەزانی کە ئیتر ئیلکای لە ڕۆحیدا ژیانێکی لەسایەی قورئاندا بنیات ناوەو خۆیشی لەدنیادا بەمستەفا بەخشیوە. لەبەر ئەمە بوو کە چاوم هیچ کەسی نەدەبینی و هیچ کوڕێك سەرنجی ڕانەدەکێشام، سەرقاڵی هەناردەکاری بووین بۆ شارێکی بچوکی ئەنادۆڵ کە تیایدا کارەکانمان دروست کردنی خوێندنگەو شوێنی نیشتەجێ بوون و نەخۆشخانە بوو بۆ خێزانە هەژارەکان، هەروەها یارمەتی دان وانەوتنەوە بوو بە قوتابیە هەژارەکانی ئەو شارە، بەهۆی ئەمەوە دیسان لەناو ئەو کەشە سیحراویەی ئەنادۆڵدا کە بەر لەچوار ساڵ تیایدا ژیابووم، دووبارە پیاسەم دەکردو لەو هەوا پاکەی ئەوێدا هەناسەم دەدا کە دەبووە دەرمانێکی مەعنەوی بۆ ئازارە دەروونیەکانم.

لەگەڵ تێپەڕ بوونی ڕۆژدا، خۆشەویستی ئەنادۆڵ و عەشقی مستەفا، لەگەڵ پێ نانم بەهەر گەڵایەکی وشك هەڵتوودا گیانیان بەبەرمدا دەکردەوە، دەبوو نزیکەی هەشت کاتژمێر بەپاس گەشت بکەم، لەخۆشحاڵیمدا وەکو چۆلەکە دەفڕیم، وەك ئەوەی دۆستە گیانی بەگیانیەکانم چەند ساڵێك بێت چاوەڕێم بن، هەستێکی خۆشم هەبوو، بەجۆرێك لەسێبەری هەر دارێکدا لە بەرزایی هەر شاخێکداو

لەبێدەنگی دەشتەکانیشدا هەستم بە بوونی ئەوان دەکردو حەسرەتی بینینی ئەوان لە دەروونمدا زیادی دەکرد.

لەگەڵ ڕۆیشتنی ئوتومبێلەکەو فرینی ڕۆحی مندا، لەناو قووڵایی ئەو هەرێمە فراوانە لە ئاسوودەیی کە هەستی کردبووم بە بۆنی دەروونە پاکەکانی ئەو مرۆڤە ساف و سادانەو ئەو خانوو ماڵە دارینانەیان دەچوومەوە بۆ ئەو پەڕی ناسکی و ڕەسەنایەتی، ئەو کەسانەی ئەوێ ئەوەندە ڕۆح شیرین و سیما نورین بوون کە لە هەریەکێکیاندا خۆشەویستیەکی سەیر هەستی پێ دەکرا. لە دڵەوە حەزم دەکرد بۆ دامرکانەوەی حەسرەتی ئەو دوو دۆستە ئازیزەم ئەمان لەئامێز بگرم.

ئەو ڕێگەیەی کە نەمدەویست کۆتایی بێت، لەکەنارێکدا تەواو دەبوو خۆمم لەناو چەپڵە ڕێزانی ئەو کچە نازدارانەدا بینیەوە کە بۆ پێشوازیمان ئامادەبوون، گرنگیپێدانی بێ ئەندازەی ئەوان و بایەخدانیان بەمیوان لەناخەوە خۆشەویستیان تیا دروست دەکردم. باوەشیان پیادەکردین و بەخێرهاتنیان دەکردین دەموت:" خودایە ئەمە خەون نەبێت" بەجۆرێك ئاسوودە بووم لەناویاندا کە دەپاڕامەوە ئەمە خەیاڵ نەبێت، ئەو ڕۆژە قوتابخانەیەك و نەخۆشخانەیەك و بەشە ناوخۆییەکمان دەکردەوە.

لەناو ئەو قەرەباڵغی و خەڵکە زۆرەی دەنگەکانیشیانم لەیەك جیانەدەکردەوە، ئەو قوتابیانەی بۆ خوێندن پارەم بۆ خەرج کرد

بوون و ناویانم نەدەزانی و نەمبینی بوون، بەگوڵەکانی دەستیان و ئامێز گرتنە گەرمەکانیان و بانگ کردنەکانیان بەدایەو دادە منی مەست کردبوو...ئەی ئەو ماچە بچووکانەی لەسەر گۆنام جێیان دەهێشت، تەواو هۆشمی برد بوو...خودایە....

## فریشتە، کە منی لەخۆم سەند بوو...

ئەو ئێوارەیە لە کۆنفرانسێکی خێزانی نووسەرێکی پەروەردەییدا کە کتێبەکانیم زۆر دەخوێندەوە بەشداریم کرد، دواتر خانمێك نۆرەی قسەکردنی هات، باسی ناڕەحەتی و ئاستەنگەکانی ژیانی خانمێکی کرد، وەکو کارەبام لێ بدرێت کاری لە دەروونم کرد، چیرۆکەکەی فرمێسکی بەهەمووان باراند.

بەندەیەکی خوا نەمابوو کە بە بەسەرهاتەکەی هەستیار نەبووبێت لەکوێ بمزانیایە ئەو سوپرایزەی چاوەڕێم دەکرد، لەوێ دەیدۆزمەوە؟ بێ ئاگا لەهەموو شتێك کچێکی تازە پێگەیشتوو کە چاوەکانی نەیدەبینی و بەناڕەحەت ڕێی دەکرد هێنایانە تەنیشتم... وتیان:

– ئیلکای خان، ئەمە ئەو خانمەیە کە مامۆستاکەمان باسی دەکرد، لەسایەی ئەو یارمەتیەی ئێوە، دەستی بەژیانی کردووەو زۆریش سەرکەوتووە...

بەو ڕووە شیرینەیەوە بەرەو لای من دەهات، هەرچەندە نەشی دەبینیم، بەدەستەکراوەکانیەوە لەلامەوە دانیشت، بەدەنگێکی فریشتە ئاساوە وتی:

- ئەم (جەوشەن) ە دایکم بۆی ناردوون، وتی ئەمە ئێوە دەپارێزێت،" ئەو بە پارەکەی ئێمەی پاراست، خوای مەزنیش بەم جەوشەنە ڕۆح و گیانی بپارێزێت، إن شاء الله پێغەمبەریش ﷺ گەورەترین پارێزەری دەبێت".

زیاتر خۆم پێ ڕانەگیرا کە بەم هەست و سۆزەوە ئەم کچە نازدارەم بینی لەدڵەوە لەئامێزم گرت، ئەویش بەو شێوازە ناسکەی خۆی وتی:

- تکایە بۆ ئێمە مەگری ئێمە لەحاڵی خۆمان نارازی نین، خوا وای ویستووە، ئەی ئەگەر هیچی پێ نەدایناپە؟ یان ئەگەر لەحاڵێکی لەمە خراپتردا بووینایە؟

دەستم هێنا بەسەریدا:

- من بەقوربانت بم... تەماشای ئەو ئیمان و تەوەککول و قەناعەتە بکە...خوایە گیان!

سوپاس گوزاری و ڕازی بوونی ئەو بەندە بێ دەسەڵاتە قەناعەت و باوەڕ پتەوی لەبەرامبەر ئەو نارازی بوون و گلەییانەی ئێمە سەرەڕای ئەو هەموو نیعمەتانە وەکو تیر دابووی لەسەرم.

– تۆ وانەی ژیانت پێ دام، وتەکانت وەکو نێردراوێك لەمێشکمدا جێی گرتووە، خۆزگە هەموو کات ڕابەرێکی نیەت پاك و باوەڕ پتەوی وەك تۆم هەبووایە، خۆم بۆ چەماندەوە لەدڵەوە داوام لێکرد:

– دەبیتە کچی من؟

بەدوو دڵیەکەوە وتی:

– نەخێر

– بەڵام بۆچی؟ من دەتوانم یارمەتیەکی باشت بدەم

– من خۆ پێویستم بەهیچ نیە...ئەو پارەیەی پێت بەخشیووم بۆ خۆشم و دایکیشم بەسە.

هەروەها من ئەگەر ببمە کچت، دەبمە بار بۆت...ئێوە بەم حاڵەمەوە بەرگەم ناگرن، دوای ئەوەش من هەرگیز لەدایکم جیانابمەوە.

– دایکیشت بانگ دەکەین..

– نەخێر، ناتوانین ئەو بهێنین...

– بۆچی؟

– چونکە ئەو ئیفلیجە، ناتوانێت لە جێی خۆی هەستێت، ئەم جارە ئیتر هیچ توانام نەما:

– ئااە...ئێوە لە گەورەترین بەندەکانی خوان....

دایکت ئیفلیجە لەجێی خۆی هەڵناسێت، تۆش نابینیت سەرەڕای ئەوەش هیچ گلەییەکت نییە و لەسەر هەموو شتێك سوپاسی خوا

دەکەیت... چی دەبوو یەك لەسەدی ئەو سوپاسگوزارییەی ئێوە لەمنیشدا هەبووایە...! وەك ئەوەی ئەو کچە جوانە حەسرەتێك بێت کە هەموو تەمەنم چاوەڕێم کردبێت لەئامێزم گرت.

- ببورە کچم ....تەنانەت بیرم چوو کە ناویشت بپرسم؟

- ناوم(فریشتە)یە.

ئیتر هۆش لەسەرمدا نەما، دەست و قاچم دەستیان بەلەرزین کرد، بەزۆر خۆم ڕاگرت تا هۆشم بمێنێت بەو پەرۆشیە زۆرەی چەند ساڵ بوو چاوەڕێی ئەو ڕابەرە بووم. پێم وت:

- کەواتە تۆ ئەو "فریشتە"یەیت! من شەو و ڕۆژ چاوەڕێی فریشتەیەکی وەکو تۆ بووم. خێرا هەستامە سەرپێ بەو ئاگرەی دەروونمەوە:

- هەستە دەمەوێت بمبەیتە لای دایکت، دەبێت باشتر بتان ناسم، وەك ئەوەی خۆشترین مژدەی ژیانم بیست بێت، لەگەڵ کچەکانی ترو فریشتەدا ڕۆشتینەماڵیان.

لەخانوویەکی نزمی یەك ژووریدا ...خانمێکی تەمەن مام ناوەند، بەڕووخسارێکی زەرد هەڵگەڕاوەوە، بەڵام چاوەکانی هاواری فیداکاری و ئیمان پتەویان بەرزدەبوەوە لە جێگەکەیدا پاڵ کەوتبوو.

دایك و باوك و کچ پێکەوە تووشی کارەساتێك بوون، باوکیان هەر لەوێدا ڕۆحی سپاردووە، دایکیان بۆ هەمیشە تووشی ئیفلیجی بووە... کچەکەشیان چاوەکانی و هەردوو قاچی لەدەست داوە،

پەروەردگارم! تاقیکردنەوەکانی تۆ هەمیشە پڕ لە حیکمەت و دانایین، ئەم دایك و کچە کە لەم هەموو بێ چارەییەیاندا بەدڵخۆشی و ئاسوودەیی بەرگەی هەموو شتێك دەگرن چۆن نابێتە پەندو حیکمەت بۆ کەسانی بەدنمەك کە لەبەر داخستنی بچوکترین دەرگا ناشکوری دەنوێنن....!

## خوا هەیە، خەم نییە:

لەو خانووە یەك ژوورییەیاندا، بەدیوارەکەوە تابلۆیەك هەڵواسرا بوو کە وێنەی باوکی بوو... لەخوارەوەی وێنەکە ئەمە نووسرابوو.." خوا هەیە، خەم نییە"... بۆخاتری خودا تەماشای ئەم ئیمان و تەسلیم بوون و هێزە مەعنەویە بکەن..! سەرەڕای ئەوەی گەورەترین کارەساتیان بەسەرهاتووە ئارامگرو سوپاسگوزارن..! وەکو پتەوترین شاخ بەرامبەر ژیان ڕاوەستاون...! لەڕاستیدا ئەمەیە کە پێی دەڵێن ئاسوودەیی ڕاستەقینە...لەپشت سەری ئەو خانمەوە چەند کتێبێك هەبوون... قورئانی پیرۆزو تەفسیر لەگەڵ کتێبێکی بچوك کە "پەیامی بیماران" بوو بەگریانێکی زۆرەوە لێیان پاڕامەوە کە بۆ چارەسەر وەرگرتنیان یارمەتی خۆی و کچەکەشی بدەم، بەڵام دایکی پەسەندی نەکرد:

- نەخێر... پەروەردگارم ژیانێکی پێ بەخشیوین ئەگەر ئەم ژیانە بگۆڕینەوە بە لەش ساغی شادبببینەوە ئیتر نەفسمان تێر ناخوات و

داوای زیاتر دەکات، نامانەوێت لەگەڵ نەفسمان ئاشت بینەوەو تاقیکردنەوەکەی بچێژین ئەم چوار دیوارە دەمان شارێتەوەو ناهێڵێت گوناه ئەنجام بدەین.

– ئێمە لەحاڵی خۆمان ڕازین، ئێوە بگەنە هاوکاری ئەوانەی کە گلەیی لەحاڵیان دەکەن.

ئای دنیا... ئای مرۆڤایەتی... ببیستن.. گوێیەکانتان بۆ ئەم قسانە باش بکەنەوە، ئەی ئەو هاوسەرانەی لەبەر بچوکترین کێشە لە هاوسەرەکەتان جیابوونەتەوە، ئەو کەسانەی لەبەر کەمترین نارەحەتی بێ ئارامیتان تووشی خەمۆکی کردوون، ئەو کەسانەی بەبێ هۆکار تاوانیان کردووە، هەموو ئەو کەسانەی دنیایان کردۆتە جێیەك کەژیانی تیا نەماوە...وەرن ببیستن...!

وەرن وانەی خۆشبەختی لەم دایك و کچە فریشتە ئاسایە وەربگرن، هەردووکیانم توند لەئامێز گرت.

دایکی وتی:

– زۆر دوعا بۆ تۆ دەکەین، ئەو کاتەی پارەکەی تۆمان پێگەیشت بەڕاستی لەپێویستیەکی زۆردا بووین. ئەو ڕۆژەو ئێستاش ئەم دوعایانەت بۆ دووبارە دەکەینەوە "خوایە لەتەمەنی ئێمە هەلگرەو تەمەنی ئەو درێژ بکە، هەموو ژیانی تووشی خێری بکە، لە کەموکوڕی و گوناهەکانی خۆشبە...ئیمانێکی پێ ببەخشە کە بەدرێژایی تەمەنی دەستی بێ چارەکان بگرێت...!"

هـــەردوو دەســتم بەڕووخســارمەوە گــرت لەبەرامبــەر ئــەو دوعــا جوانەیاندا، دواتر دەستەکانیم ماچ کرد.

- دڵنیــام کــە بــەدوعاکانی ئێوەیــە مــن بــە پێــوە ڕاوەســتاوم. ئێــوە فریشتەن لە شـێوەی مرۆڤـدا! ئـەم هیدایەتـەی منـیش لەسایەی نـزا وەرگیراوەکانی ئێوەیە.

مــن ئــەوەی لــەدنیاو لەهــەر چــواردەورمدا بــۆی دەگــەڕام، لەخانۆچکەیەکدا و لە دوو مرۆڤی گەورە، دایك و کچێکی وەك ئێـوەدا دۆزیمەوە.

تەداوی دەردی من لەلای دایکێکی ئیفلیج و کچێکی نابینـا بـوو!..

چــەندین کاتــژمێر نەمــدەتوانی ئــەو دایــك و کچــە جــێ بهــێڵم، هــەر بەجیابوونــەوەم لێیــان... ڕێنمــاییم بەبەردەســتەکانم دا کــە مــاڵێکی جوان بۆ فریشتە و دایکـی بکڕدرێـت... بـەدەر لەوانـەش ئۆتۆمبێلێـك دابین بکەن کە هەموو ڕۆژێك فریشتە لە ماڵەوە بگەیەنێتە قوتابخانە.

ئەو شەوە تا بەیانی ناوچەوانم لە سوجدە بەرز نـەکردەوە. لـەخوا پاڕامەوەو فرمێسکم ڕشت، ئیتر گـەورەترین گەنجینـەی دەوڵەمەنـدی من ئەوان بـوون، کـە گەڕامـەوە بـۆ شـوێنی کارەکـەم بڕیـارم دا ئـیتر دەبێـت هـەموو دارایـیم لـەم ڕێگەیـەدا خـەرج بکرێـت، هـەموو سـاڵێك ناحیەیــەکم هەڵدەبــژاردو بــۆ دابــین کردنــی خوێنــدنێکی بــاش بــۆ هــەژارەکان هـــەموو هـــەوڵی خـــۆمم دەدا، بەتایبـــەتیش گرنگیـــدان بەقوتابییە زیـرەك و بلیمەتـەکان. مـادام نەگەیشـتم بـەو مستەفایەی

تەمەنی بۆ ئیمان و قورئان دانا بوو. منیش بەیەکلایی کردنەوەی خۆم بۆ ئەم ڕێگەیە، بڕیارم دا سەرەتا ببمە بەندەیەکی باشی پەروەردگارم، پاشان هاوسەرێکی شیاو بۆ مستەفا. لەوانەیە ڕۆژێك لەڕۆژان لە داهاتوودا یەك ببینینەوە، بابزانێت من ژیانی خۆم بۆ ئەم کارە تەرخان کردووەو، تێبگات کە بەهاوسەرگیری نەکردنیشم خۆشەویستیەکەم لە لەکەداربوون پاراستوە.

## باوکم بڕیاری سەرکوتکردن و زایەکردنی منی دابوو

باوکم لەبەر ئەوەی خۆشەویستی و گرنگی دانی من بەخواو دین بەئارەزوو هەوەسێکی کاتی تێگەیشتبوو، ئەو ماوە زۆرە لەسەر کارەکانم دەنگێکی لێوە نەهاتبوو. ڕەنگیشە ئەمەی لەپێناو بەدەست هێنانی ئەو گەنجە بەئەزموون و خاوەن توانایە" مستەفا" دا قبوڵ کردبێت، بەڵام خەریك بوو حاڵی دەبوو، من بوومەتە ژنە بازرگانێك و ئەمەش کە دێتە دەستم لەکاری خێرو بۆ پەروەردەو خوێندن خەرجی دەکەم.

بەشێوەیەکی هەست پێ کراو بەرەنگاربونەوەی خۆی دەردەخست. خراپ بوونی بارودۆخەکەش کاتێك دەستی پێ کرد، کە زانی من دایکیشم هێناوەتە لای خۆم و یارمەتی ئەو چینە دیندارەی کۆمەڵگا دەدەین، ئەمەش پێچەوانەی فەلسەفەی خێزانی ئێمە بوو.

لەکارەکانمدا ڕێگری خێزانی دروست دەکردو لەهەموو بەگژدا چوونەوەیەکیشماندا باوکم بەتووڕەبوون خۆی دەرباز دەکرد، کەسێك کە هەموو ژیانی بەدوژمنایەتی خواو کەسانی دیندارەوە بەسەر بردووە هەرگیز چاوی لەخزمەتەکانی کچەکەی لەم بوارەدا نەدەپۆشی زۆر باش هەستم بەو لێپرسینەوانە کردبوو، باوکم کە لەبارەی منەوە چەندین هەواڵی هەڵەو درۆی پێ گەیەنرابوو، لەجیاتی ئەوەی ئەو کێشەیەم لەماڵەوە لەگەڵ باس بکات بانگی کردمە شوێنی کارەکەی خۆی، ئەمەش پلانێکی شەیتانانە بوو.

تا ئەو ڕۆژە باوکمم بەو تووڕەییە نەدیبوو، بەڕوانینەکانی وادەردەکەوت بیەوێت گیانم لێ بسێنێت، بەهەموو جۆرێك نەفرەتی لێ دەباری، دایکم کە لەتەنیشتیەوە بوو، وەك ئەوەی پێشبینی هەموو شتێکی کردبێت، بەنیگا خەماویەکانی هەموو شتێکی تێ دەگەیاندم، وەکو ئەوەی بڵێت: "کچم نەکەی دەنگت لێوە دەربێت، هەرچی وت بڵێ بەسەر چاو، ئەو پیاوە بڕیاری داوە تۆ زایە بکات، ئەگەر بەبێ دەنگی گوێڕایەڵی بکەیت ڕزگارت دەبێت، ئەگەر نا پێت ناڵێت "کچم" بێ ڕەحمانە لەدەستت دەدات، چونکە ئەو ڕەت کردنەوەو بەگژداچوونەوەی پرنەسیپەکانی و بەبچوك تەماشاکردن لەهیچ کەسێکی دەوروبەری قبووڵ ناکات".

لەژوورەکەدا ڕاوێژکارەکانی بەڕێوەبەرو دارودەستەی کۆمپانیاکەی و تەنانەت هەندێك لەکاربەدەستانی کۆمپانیاکەی منیش ئامادەبوون،

ئەم ناوەندە کە بەتەواوی وەکو دادگا وابوو هەموو شتێکی باس دەکرد.

لەبەردەممدا دوو هەڵبژاردە هەبوو، یان لەدنیاکەی باوکمدا بە درێژایی تەمەنم ڕۆح و دڵم بەپارە دەفرۆشت و بەرامبەر خواو دین ڕادەوەستام یاخود لەگەڵ ڕازی بوون بەهەر سزایەك، وەکو کەسێك کە هەموو شتێکی لەدەست دابێت، دەگەڕامەوە ناو خەڵکە دڵ و دەروون پاکەکەی ئەنادۆڵ. ئەمە بۆ من بڕیارێکی زۆر سەخت بوو. کچێك کە لە هەبوونی و دەوڵەمەندیدا گەورە بووە، دروست کردنی ژیانێکی هەژارانە چەندە بارێکی گران بوو بۆم؟ ئەگەر تەنانەت خۆشم ئەوەم پێ هەڵسوڕایە، ئایا باوکم لەوە خۆش دەبوو؟!! بەو پیاوانەی خۆی کە ئیشیان خوێن ڕشتن بوو، بەسەد جۆر لەکارو شوێنی ژیانم دەری نەدەکردم؟ بەو هەموو پرسیارە ئاڵۆزو خەمە لێك ئاڵۆسکاوانەوە کە لە مێشکمدا دەهاتن و دەچوون بۆ هەموو شتێك ئامادە بووم، بەشێوەیەکی زۆر قورس تاوانبار دەکرام، کەسیش نەیدەوێرا بەرگریم لێ بکات، ئەگەر گوێم بۆ نەگرتایە، دوورنەبوو هەر لەوێدا بەتاوانبار کردنم، زۆر بەبێ دەنگی لەپەتی سێدارەی بدامایە.

چاوەکانم داخست، ئەو نووسینەم هاتەوە بیر کە لە ماڵی فریشتە بەدیوارەکەوە هەڵواسرابوو:

" خوا هەیە، خەم نییە"...

ئۆۆۆۆ.. هەناسەیەکی قوڵم هەڵمژی .

تەسلیم بووم بەخواو لە دڵی خۆمدا وتم:"ئەگەر ئێوە هێزتان هەیە، ئەوا منیش خوام هەیە..." لەوکاتەدا کە خۆم بۆ ڕووبەڕووبوونەوەی ئەو هەموو تووڕەیی و قینەی باوکم ئامادە دەکرد، پوورە فاطمە لەبەر چاوم دەرکەوت. بە ڕووە نورین و زەردەخەنە شیرینەکەیەوە.. باڵەکانی کردەوە وەك ئەوەی بیەوێت لەباوەشی میهرەبانی خۆیم بگرێت وردە وردە دەستی بە قسەکرد:

- کچم لەبیرت نەچێت، ئەوەی پشت بەخوا ببەستێت سەردەکەوێت... ئەوەش کە پشت بەبەندە ببەستێت دەدۆڕێت... ئەگەر خوا ویستی لە ئەنجامدانی شتێك نەبێت، هێزی هەموو مرۆڤایەتی کۆببێتەوە ئەو ئیشە بە ئەنجام ناگات، ئەگەریش خوا ویستی لەسەر شتێك هەبێت، هەموو خەڵکیش کۆببێتەوە ناتوانێت بەر بەو کارە بگرێت.. مەترسە.. دوژمنەکانی خوا، ناتوانن زیان بەبەندەیەکی خۆشەویستی خوا بگەیەنن. ویستم هەستم و تاو بدەمە دەستەکانی، بەڵام لەناکاو لەبەر چاوم فڕی و نەما...

ئەم دەست گرتنە مەعنەویەی پوورە فاطمە لەسەختترین کاتدا بووە سەرچاوەیەکی هێز بۆم، ئیتر ئامادەی هەموو شتێك بووم لەدوای ئەم هێز پێدانەوە چی دەبێت بابێت...!

ئیتر با لەسەر کارەکەم لامببەن، لەماڵەوە دەرمبکەن، ئەگەر بیانەوێت با بەدەستی پیاو کوژێك بشمکوژن، مردن لەپێناوی خوادا جوان بوو.. من کە لەمردن نەترسم، لەهیچی تریش ناترسم...

بەتەواوی لەوکاتەدا بوو:

بەڵێ ئیتر باوکم کە بە هەموو پیاوەکانی منیان ئابڵۆقە دابوو، هەستایە سەرپێ و دەستەکانی بە هەموو تووڕەیی خۆیەوە ڕاوەشاندو وشە ڕەقەکانی کە دەتوت بۆمبایەك لەناو دەمیدا تەقیوەتەوە دانەدانە ڕیزی کردن:

- سەیری من بکە... من بۆ بەدەست هێنانی ئەم شکۆ و هێزە هەموو تەمەنم سەرف کرد، ئەو کەسەی دەبێتە میراتگری من دەبێت وەکو خۆم بێت، ئەگەر ئەم شتە پوچانەی وەك خواو دین و پێغەمبەر(أستغفر الله) لەمێشکت دەرنەکەیت، هەر ئێستا دەتدەمە دەست گورگە برسیەکان. ئیتر من منالێکم نییە..

من دەوروبەرێکی کراوەم هەیە، کە هەمووان ئاگادرای فیکرو فەلسەفەی منن... دوورن لە دەمارگیری و کۆنەپەرستی ڕێگەی ئێمە خوا نا، بەڵکو ئەقڵ و زانست دیاری دەکات..... یان دەبیتە کچێك شیاوی من بێت، یان لەمڕۆوە هەموو شتێکت لێ دەسەندرێتەوەو فڕێ دەدرێیتە کۆلان، یەك شانست پێ دەبەخشم. ئەگەر داواکاری و ویستەکانم ڕەت بکەیتەوە، ئەوا لەئەمڕۆوە لەلای من بەنەبوو هەژمار دەکرێیت... بەمەش تەواو نابێت، ماوەی دوو ساڵ لەژێر چاودێری خۆمدا دەمێنێتەوە، ئەگەر بەدڵم بوویت ئەوە لەبەختتە، ئەگەر نەبوویت ئیتر دەبێت ئارەزووی مەرگ بکەیت.. ئێستا فەرمانت پێ

دەکـەم. لەگـەڵ کـاك فـارووقی ڕاوێژکارمـدا بـەزوویی هاوسـەرگیری دەکەیت و دەبیتە هاوسەرێکی بـاش بـۆی، هـەموو پەیوەندیەکیشت لەگەڵ دەمارگیر و کەللەڕەقەکان دەپچڕێنیت.

کە ناوی فارووقی بێ دینم بیست، ئیتر ئەوەی دوای ئەو هیچ بـۆم گـرنگ نـەبوو... لەوکاتـەدا وەکـو دارێکـی نـاوبۆش ڕووخـام... خۆشەویستی مستەفا کە بۆ خولەکێکیش لەبیرم نەدەکرد ڕژایەوە ناو دەروونم بەرگـەی هـەموو بـەڵاو فیداکاریـەکم دەگـرت بـەڵام هـەرگیز نەدەکەوتمـە بـیری کەسـێکی تـر جگـە لـەو مسـتەفایەی خـۆمم بـۆ ئامادەکردبوو.

لـەو وتـە سـامناك و تۆقێنـەرو مـەرگ هێنانـەی لـە دەمـی بـاوکی سەختگیرم هاتنەدەر، ئەوەندە سڕو غەمگین بووم کە هێزی هیچم پێ نەمابوو جگەلەوەی بەهەموو بونمەوە لە ناوخۆمدا هاوارم دەکرد:

– پەروەردگارم...ڕزگارم بکە...

ئـیتر لەبـەر چـاوی هەموانـدا و هـەر لەوکاتـەدا ئـەو ڕووداوە چاوەڕوان نـەکراوە ڕوویـدا کـە هـەموانی لەسەرسـامی دا هێشـتەوە، ڕووداوێکی پـڕ لـە ڕاز کـە پلانـەکانی بـاوکمی تێکدا و سـەرەو ژووری کرد..

لەو کاتەی ئـەو وشـە ژەهراویانـە وەك فیشـەك یـەك لـەدوای یـەك لەدەمی باوکم دەردەچوون لەناکاو ڕەشاییەکم هەست پێ کرد کـە لـە

پشت منەوە هات و زۆر بەخێرایی گەیشتە باوکم بەڵام چی بوو؟ نەمزانی..!

باوکم کە کەمێك لەوە پێش بەتووڕەبوونەوە پەنجەکانی ڕادەوەشاندو هەڕەشەی لە من دەکرد، لەو ساتەدا بە بەرچاوی هەمووانەوە وەك خانوویەك داڕماو کەوتە سەر زەوی، هەموو پیاوەکانی لەچاو تروکانێکدا گەیشتنە سەری دایکیشم کە خەریك بوو لەهۆش خۆی دەچوو ڕای کردە لای و دەستی کرد بە هاوار کردن.

منیش لە ژێر باری ئەو شۆکە قورسەدا کەنەمزانی چی بوو! ڕاما بووم...بەڵام ئەو سێبەرە پڕنهێنییەم بە تۆڵەیەکی ئیلاهی دەزانی کەبەبێ دەنگی هاتە ژوورەکەوە... لەو سەرسوڕمانە زۆرەدا بەهەموو توانام هاوارم کرد:

– پەروەردگارم....!

ئەو خوایەم کە بەندەیەکی پشت بەستوو باوەڕ پتەو بەخۆی هەرگیز بەجێ ناهێڵێت! ئەو خوایەم کە مرۆڤە سەخت گیرەکانی بەجۆرێك وانە پێدەدات، کە ببنە داستانی سەر زمانی خەڵکی!

ماوەی کاتژمێرێك لەناو ئارەقی خۆمدا لەو بارە قورسەدا ژیام، دواتریش بەو ڕووداوە جەهەننەمیە جارێکی تر لەشەرەف و نرخی بەندەکانی ئیمان پتەوی خوا و جیاوازی لەگەڵ ئەوانی تر تێگەیشتم، سەرەڕای ئەمانەش هەرچەندە ئەو دوژمنی خوا بێت، چەندەش پلان

دابڕێژێت بۆ هەڵکەندنی باوەڕو دینەکەم لەدڵمدا، بەڵام ئەو دیسانیش هەر باوکم بوو.

بەبینینی ئەو بەکەوتوویی لەناوەڕاستی ئەو ژوورەدا کە چەندەها دۆلاری بۆ ڕازاندنەوەی خەرج کردبوو، بەرگەم نەگرت و لەجێگەکەم هەستام و ڕامکردە سەری. ئەو هەموو هاوارو فریادو ڕاکردنەی ژوورەکەی پڕ کردبوو، دەردی باوکمی دەوا نەدەکرد. خەریك بوو دوایین هەناسەکانی دەدا. لەماوەیەکی زۆر کەمدا دەستەی سەلامەتی تایبەتی باوکم گەیشتن، هەموو لێهاتوویی خۆیان بەکار هێنا بەڵام تازە دەرهێنانەوەی لە چنگی ئیزرائیل مەحاڵ بوو.

ئای خوایە ! ! حاڵێکی ئەوەندە سامناك و تۆقێنەر بوو. باوکم جەستەی لەناو ئارەقدا نوقوم بوو بوو، وەك ئەوەی بیەوێت لەدەستی سەدان قەساب ڕزگاری ببێت بەڕادەیەك ڕەنجی دەدا و دەتلایەوە کە ناتوانم وەسفی بکەم...

ناڵەو هاوارەکانی لە قوڕگیدا پەنگیان خواردبوەوە، شینبوونەوەی ڕووخساری و ئەبڵەق بوونی چاوەکانی دەریان دەخست کە لە چ سزاو ئازارێکدایە، ئەو حاڵە پەرێشانەی هەموو ئەوانەی ناو ژوورەکەی ترساندبوو، بەنینۆکەکانی زەوی هەڵدەکەند لەپێناو یەك هەناسەی تردا، وەکو منداڵێکی بێ چارە لەوانەی دەوروبەریەوە چاوەڕێی یارمەتیەك بوو، سەری بەلای چەپ و ڕاستدا دەهێناو دەبرد وەك ئەوەی بزانێت کە ساتەوەختی مەرگەو نەیەوێت خۆی بدات

بەدەستەوە...ئەمە سزایەکی ئەوەندە سەخت بوو بۆ باوکم، کەبەرگەی تەماشاکردنیشم نەدەگرت...

چاوە داچەقیوەکانی و سەیرکردنە بێچارەکانی کە موچڕکەی بەلەشدا دەهێنا، هێندە پڕپەندبوون پیاوەکانی چواردەوری تا ڕادەی هەڵهاتن تۆقاندبوو.

باوکم بەدرێژایی تەمەنی دژایەتی خوای کردووە، فریشتەی گیان کێشان بەشێوەیەکی زۆر ترسێنەرو بەرگەنەگیراو لەبەر چاوی هەمووواندا سزای دەدا، ئاه باوکە! چی دەبوو ئەگەر پارەو ئەم ژیانە کورتەت بەهەمیشەیی نەزانیایە! چی دەبوو لەم دەوروبەرە بەرژەوەندی خوازەت دابڕایتایە! چی دەبوو دەرکت بەوەبکردایە کە ئەو زاتەی دروستی کردویت لەناوەختێکدا دەتباتەوە....! ئەی چی دەبوو دۆست و ئاشنا گەلێکت هەبوایە کە هەمووان دەست بە دوعا و نزا بونایە بۆت!! ئاخ باوکە..دژایەتی خوات کردو هەموو تەمەنت سەرقاڵی پێکەوەنانی پارە بوویت، بەڵام دەوڵەمەندی و سەروەتەکەت نەیانتوانی بەرەنگاری ئازارەکانت ببنەوە...لەوە تێنەگەیشتیت کە کاتێك لەدایك بویت پرست پێ نەکرا، بۆ مردنیش پرست پێ ناکرێت...

ژیانی دوای مەرگ هیچ گرنگیەکی بۆت نەبوو؟ بۆچی بیرت لەوە نەدەکردەوە ئەو دۆستانەت کە لەسەر دژایەتی خوا ڕایان هێناویت هاوڕێیەتیان تەنها تا دەرگای گۆڕەکەت دەبێت!

هەرگیز گوێت بۆ ئەوانە نەدەگرت کەدەیان وت: دەوڵەمەندی ئەوە نیە کە لە دنیادا بەجێی دەهێڵێت، بەڵکو ئەوەیە کەبۆ ئاخیرەتتی دەنێریت!

تۆ ماڵ و ناوبانگت دۆزیەوە، بەڵام بەهەڵەو تاوانەکانت خوات ون کرد، هیچ بەڵایەك لەمە گەورەتر هەیە بۆ مرۆڤ؟! باوکە گیان، ئەوە بزانە ئەگەر گومانم ببردایە ڕۆحم بەکەڵکت دێ، پێم دەبەخشیت.. تۆ ستەمکردنت لە من بەشیاو زانی کە هیچ باوکێك نایکات، بەڵام من دیسان و بۆ هەمیشە گەردنت ئازاد دەکەم، بەرگەی ئەوە ناگرم لەبەر من لەئاخیرەتتدا سزا بدرێیت، إن شاء الله پەروەردگاریشم لە ڕەحمەتەکەی بێ بەشت ناکات.

لەوکاتەدا باوکم دەنگێکی زۆر ترسناکی بەوێنەی مرخەی ئاژەڵێك لەکاتی سەربڕیندا لێوە دەرچوو، ئەمەلای من وەکو وەڵامێك وابوو، کە دەیەوێت بڵێت:" من لەو ڕەحمەتە بێ بەش بووم، هیچ ئومێدێکم نییە"، ئەم دەنگە ئەوەندە تۆقێنەر لەژوورەکەدا دەنگی دایەوە، کە هەموو ئەوانەی بیستیان توند گوێیەکانیان گرت و بۆ ئەوەی ئەو دیمەنە نەبینن دەستیان بەچاوەکانیانەوە دەگرت، پزیشکەکانی پشت سەریشی لەسامناکی ئەو تابلۆیەدا دەلەرزین.

لەلایەك بۆ هاوارو ناڵەی باوکی لەزەویدا کەوتووم دەگریام، لەلایەکی تریش شت گەلێکی سەیر بەمێشکمدا دەهاتن: چەندین جار

ئەو وتەیەی لەدایکی فریشتە بیستم، لەدوا هەناسەکانی باوکمدا دووبارەم دەکردەوە:

" ئەوەی خوا بدۆزێتەوە ئیتر چی لەدەست دەچێت! ؟ ئەوەی خوای لەدەست بچێت ئیتر چی دەدۆزێتەوە؟! ئەگەریش بیدۆزێتەوە دەبێتە بەلا بۆی.. ".

ئەم وتە پڕ پەندە، بەتەواوی باسی لەباوکم دەکرد، لەبەر ئەوەی خوای لەدەست چوو بوو، هەموو ئەوانەی هەی بوو، بوو بوونە بەلا بۆی، بەلایەکی ئەوەندە گەورەبوو جگە لەوەی دۆستێکی لەدوای خۆی نەبوو، کارێکی خێریشی بەنسیب نەبوو بوو. هەموو دیمەنەکانی ژیانی پڕ بوون لەبەرەنگار بوونەوەی دین و ئیمان و ئەنجام دانی هەڵەو تاوان ژیانی ئاخیرەتی ئەم جۆرە کەسانە تەنانەت بیرلێ کردنەوەشی تۆقێنەرە، لەدیمەنێکی مەرگەساتی وادا گیانیان دەکێشرێت کە دەبنە وانەیەکی پڕ پەندو دەکەونە سەر زمانەکان ئای لەو دوایین هەناسەیە...!

خوایە چ گیانێك بەرگەی دەگرێت!

کۆتا ڕوانینی بۆ فریادی یارمەتی، ئاڕاستەی دایکم کرد... دەستەکانی کردەوە وەك ئەوەی بپاڕێتەوە، بەلام هیچی لێ نەبیسترا، وشەکان لەناو قوڕگیدا پەنگیان دەخواردەوەو بەرەو دیمەنێکی سامناکی خنکانیان دەبرد. پەروەردگارم.. ئەمە ئەوەندە ترسناك بوو. وەك بڵێی ئەو کەسەی لەژوورەکەدا گیانی دەدا، بەتەنها

ئەو نەبوو بەڵکو هەموو ئامادەبوانیش بوون، چونکە بینینی باوکم بەو جۆرە و بیستنی دەنگی پچڕ پچڕی مرخە مرخەکانی گوێیەکانی پارچە پارچە دەکرد.

چەندین ڕۆژ ئەو دیمەنەم لەبەر چاو نەدەڕۆیشت، بەردەوام بیرم لیێ دەکردەوە، ماڵئاواییەك بوو کە تەنانەت نەدەچووە خەون و خەیاڵەکانیشمەوە، ئیتر لەو کاتەوە هەموو گەردیلەکانی لەشم مەرگیان دەرك کردبوو ئیتر مەرگ بووبووە بەشێك لە من، زۆر باش لەمە تێگەیشتم: چەندە پێویستە قوتابیەك بەهەموو توانایەوە هەوڵ و ئامادەکاری بۆ تاقیکردنەوەیەکی بدات، بەو جۆرەو بەشێوەیەکی زۆر ڕێکخراوتر لەوەش پێویستە ئامادەکاری بۆ مردن بکەین.

بێگومان ئەو ئامادەکارییەش تەنها بەئەنجامدانی پەرستشەکان و کردەوەی جوان دەبێت، ئەو کەسانەی ئەمە پشتگوێ دەخەن بەدڵنیاییەوە لەکاتی هاتنی ئیزرائیل و کۆتا هەناسەکانیاندا حاڵیان لە باوکم باشتر نابێت.

# بەشی چوارەم

## تاقیکردنەوەی ژیانم لەڕاستیدا ئێستا دەستی پێ دەکرد



### چواردەورم بە خەڵکانی ناپاك، تەنرابوو:

تەماشای ئیشی خوا بکەن، لەگەڵ ئەوەی باوکم بەو هەموو هێزو دەسەڵاتەیەوە منی بانگکردە بەردەمی خۆی و لەبەر چاوی هەموو ئەندام و پیاوەکانیدا بۆ لێپرسینەوەم پلانی ئامادەکرد بوو، بەڵام خوای گەورە تەواو پێچەوانەی نیشانی هەمووان دا و منی کردە براوە..! لەبەر ئەوەی من تاکە میراتگری باوکم بووم، بەڕێوەبردنی کۆمپانیاکە بەتەنها بۆ من جێ مابوو.

بەداخەوە ئاگاداری ئەو سوپرایزانە نەبووم کە بەهۆی ئەو کارەوە بەسەرم دەهات. کاتێك تێگەیشتم باوکم لەدەست گیرۆیی گرووپە خراپەکان و تێکەڵاوی بەپەیوەندییە پیسەکان دا ڕۆڵی بەرزی هەیە. بەڕاستی زۆر تووڕە و خەمبار بووم، هەر بۆیە بەگرتنە دەستی کارەکانم، یەکەمین و گرنگترین کار کە کردم گۆڕینی کادرو ئەندامە گرنگەکانی کۆمپانیا بوو بەکەسی متمانە پێکراو، بەڵام لەکاتی ئەنجامدانی ئەمەدا چەندە تووشی ناڕەحەتی بووم! ناتوانم باسی بکەم...چەندین جار هەوڵی لێ سەندنەوەی ئەو دەسەڵاتەم درا، چەندین جار پیلانی تێوەگلان بەفێڵەکانیانم بۆ دارێژرا، چەندین جاریش هەڕەشەی مەرگم پێ گەیشت، لەدوای ئەو هەموو بەرەنگاربوونەوەو هەڕەشانەی لێم کرا ئەگەر ئێستا بەپێوە ماوم بەتەنها لەبەر پارێزگاری پەروەردگارمە، ئەو کاتەی لەهۆکاری ئەو هەموو ڕووبەڕووبونەوە سەختانە تێگەیشتم بە هەموو مانایەك وەکو شێتم لێهات.

وەك دەردەکەوت، باوکم بەئابلۆقەدان و سنووردار کردنەکانمەوە ڕانەوەستاوە، بەڵکو تەنانەت ئەگەری کوشتنیشمی لەبەرچاو گرتووە هۆکارەکەشی ئەوە بوو کە من تەنها میراتگری ئەو بووم، لەبەر ئەوە لەوە ترساوە کە من دەست بخەمە کارەکانیەوەو ئەو پلانانەی لێ تێك بدەم...

باوکم هەر لە قاچاخچێتی چەکەوە تا بازرگانی ماددەی هۆشبەرو تا بەشداری کردن لە چەندین جۆری تر کاری نایاسایی و تەنانەت پەیوەندی کردن بەچەتەکانیشەوە خەریك بووە... !

بۆ ئەم کارانەش چەندین پیاوی چەتەی هەبووە کە تێری کردوون و بۆ ئەم کارانەی بەکارهێناون. ئەوانە دەهاتنە لام و داوای حەق و پارەی چەند وەخت لەوەوپێشی خۆیان دەکرد، من سەرسام و پەرێشان بوو بووم. چەکی بەهەموو ڕێکخراوە تیرۆرستییەکان فرۆشتووە، بەشداری کاری هەموو ڕێکخراوو لایەنێکی کارە خراپ و دوور لە ڕەوشتەکانی کردووە کە بە وتەی خۆی وتویەتی:" ئیلحاد خەریکە لەدەست دەچێت"، بۆ ئەمەش خەرجی هەموو بەرەنگاربوونەوەیەکی ئەمەی داوە. زۆر بەتایبەتیش خەرجی ئەو ڕێکخراوو لایەنانەی کە دژی دین بەیاسایی یان نایاسایی کاریان کردووە کێشاوە. دیارە کە باوکم بۆتە داردەستی ئەو بیرمەندە تاریك بینانەو وەکو سەربازی شەترەنج یاریان پێ کردووە، لەلایەك بەبێ دەست پاراستن لەحەرام پارەی بەلێشاو بەدەست هێناوە، لەلایەکی تریش بەو پارەیە پێویستی دارایی ئەو کەسانەی گرتوەتە خۆ، کە کار بۆ هەڵکەندنی حەق و ڕاستی و بڵاوکردنەوەی چەواشەکاری لەناو خەڵکیدا دەکەن. هەر کە هەستم بەم ڕێکخستن و پلانانەی باوکم کرد بەتوندی ڕووبەڕووبومەوە. کاتێك تێگەیشتن داواکاریەکانیان لەمنەوە بەدەست ناخرێت، سەرەتا بەهەڕەشە کردن و دواتر هەوڵیان بۆ

کوشتنم دا. پەروەردگارم ڕێگەی بەم هەوڵانەیان نەدا، ئەمجارە تەقەلای ڕووخاندن و پوکاندنەوەی کۆمپانیاکەیان دەدا.

ئەوان درکیان بەوەکرد بوو کە دەوروبەرم بەمرۆڤی لێهاتو و چاونەترس پڕکردۆتەوە هەر بۆیە پلانی ئەوەیان دادەڕشت کە ئەمجارە دانەدانە لە ڕیز دەریان بکەن و لەناویان بەرن.

هەندێکیان تووشی کارەساتی ئۆتۆمبێل دەبوون، هەندێکی تریان هاوسەرەکانیان ماڵیان جێ دەهێشت، ئەوانی تر بەڵا بەسەر منداڵەکانیان دەهات، هەمووان مەترسی و پەشێویان تێکەوتبوو.

بەهەموو توانامەوە لەناو ئەو بارە قورسەدا هەنگاوم دەنا، شەوان تا بەیانی بۆ ڕێگە چارەی دەرباز بوون لەخوا دەپاڕامەوە، ئەمە لەکاتێکدا من دەست کەوت و دەسەڵاتەکانی کۆمپانیاکەمم بەتەنها بۆ ئەنجام دان و خەرجی کارە خێرخوازییەکان بە ڕاگیرکراوی دەهێشتەوە ئەگەر نا من و دایکم ژیانێکی ئاسایی و سادەمان بەس بوو، هەر ئەو ناپاکانەی کە ئاگاداری ئەم نیەتەم بوون، دەیانویست بەربەست بۆ کارەکانی کۆمپانیا دروست بکەن.

## ڕازی ناو دەنگی بانگ...

لەلایەك ئەم کۆششەم بۆ کارەکانم بەردەوام بوو، لەلایەکی دیکەشەوە هەر لەبیری موستەفادا بووم، ناتوانم بیدرکێنم کە چەندەم پێویست بە شارەزایی "مستەفا" هەبوو لەم مەسەلانەدا. ئەگەر لەبەر

دووباره هێزپێدانەوەم و بەرزکردنەوەی ورەی ڕووخاویشم بوایە، زۆر ئارەزووی بینینم دەکرد، هیچ یەکێك لەو داخوازی کارانەی لەدەرگایان دەدام جێگەی مستەفایان نەدەگرتەوە، لەبەر ئەوە بەو چاوەوە تەماشای هیچ کەسێکم نەدەکرد، چونکە هەر لەڕۆژی یەکەمی ڕووبەڕووبونەوەمانەوە، ئەوینی مستەفا لەناو دەمارەکانمدا دەسوڕایەوەو لە ڕازاندنەوەی خەونەکانم بەردەوام بوو.

لە سەختترین کاتەکانیشمدا لەناڕەحەترین بەرەنگاربوونەوەکانیشمدا بەرگەم دەگرت و بەخەیاڵی ڕۆژێك گەیشتن بەو بەپێوە ڕادەوەستام...

بۆ کەمێك دوورکەوتنەوە لەو کەشە خنکێنەرەی ژیانی کارو بەدابین کردنی خەرجی پێویست بۆ سەدان قوتابی لەلایەن کۆمپانیاکەمانەوە بڕیاری ئەوەمان دا بەسەردانێك بچینە (چەنەکالیٚ)، چەند ژنە بازرگانێك و دوو مامۆستای پەروەردەش هاوڕێیەتیان دەکردین، پاسەکەمان بۆ ئەنجامدانی نوێژی نیوەڕۆ، لەمزگەوتێکی بچوکی کەنار یەکێك لەو شارانەی هاتە ڕێمان ڕاوەستا، دوای ئەنجامدانی نوێژەکەمان لەویٚ دەکەوتینەوەڕیٚ بەلام ئەو دەنگی بانگەی کە بیستمان زۆر بەخێرایی کاری لەهەموو گیانم کرد و پەرۆشیەکی گەورەی لەدەروونمدا چاند بەو هەموو هەستە سەیرانەمەوە خۆم لەدنیایەکی تردا دۆزیبوەوە.

ئای خوایه گیان! ئەو دەنگە چەندە لەدەنگی مستەفا دەچوو! بەپەلە دەست نوێژەکەمان گرت و نوێژەکانمان بەجێ هێنا. دەمویست بەرلەوەی مەلا دەربچێت، بگەمە لای، لەبەرئەوەی قوتابی و هاورێیانم گومان نەکەن، وام تێگەیاندن کە لەبارەی باسێکەوە دەمەوێت پرس بەئیمام بکەم، کاتێك لەدوای نوێژ دانە دانە نوێژ خوێنان دەردەچوون منیش کە دڵم زۆر بەخێرایی لێی دەدا، لە چاوەڕوانی ئەو ئیمامەدا بووم کە بە مستەفام دەزانی...! ئای خودایە، هەستێکی زۆر سەیرم بۆ دروست بوو، دەترسام لەهۆش خۆم بچم، کاتێك لەگەڵ ئەو ئیمامە گەنجەی کە من بە مستەفام دەزانی و لەدوای هەمووان هاتە دەر ڕووبەڕووبوینەوە، حاڵم زۆر شپرزە بوو، مامۆستا کە ئەو حاڵە پەرێشان و ڕەنگ پەڕیوەمی بینی، بە ڕێزێکی زۆرەوە وتی:

– پرس و داواکاریەکتان هەبوو خانم؟! بەرلەوەی وەڵام لەمنەوە وەربگرێت، بەبچوککردنەوەی چاوەکانی سەرنجێکی وردتری دا.. وتی:

– دەبێت ئێوە ئیلکای خان بن! ئێوەم لە ئیتالیا بینیوە، باستان لەکارەکانتان دەکرد بۆ یارمەتی دانی قوتابیە هەژارەکان، من ئەو کاتە قوتابی بووم، لەزانستە سیاسیەکاندا سەرقاڵی خوێندنی دکتۆرا بووم، یارمەتی زۆری قوتابیەکانی ئەوێتان دا، بیرم نایەت چەندەم دوعا بۆ ئێوە کرد... بەڕاستی پیرۆزباییتان لێ دەکەم، خوا لێتان

ڕازی بێت، وڵاتەکەمان پێویستی زۆری بەکەسانی وەکو ئێوەیە. بەبەخشینی دارایی و تواناکانتان بەبواری پەروەردەو فێرکردن دەبنە خاڵی بەرەنگاربوونەوەو خۆڕاگری کۆمەڵگایەکی ڕووخاو لە مەعنەویاتدا، بناغەی ڕاگری بەهاکان لە کۆمەڵگەدا بەپارێزراوی دەهێڵنەوە دوعاکانمان هەمیشە لەگەڵ ئێوە و کەسانی تری خێرخوازی وەکو ئێوە دەبێت.

زۆر شەرمەزار بووم... لەکوێ بمزانیایە، ئەو خزمەتە بچوکانەی پێی هەڵدەستم بەو جۆرە بەگرنگیەوە چاودێری دەکران! ئەو لاوە خوێن گەرمەی بەڕەفتارە جوانەکانی هەر زوو کاری لەمرۆڤ دەکرد، بەردەوام بوو:

– ببەخشن... بەبێ پرس کردن بەئێوە لەپەرۆشیمدا کەوتمە قسە... ئێستا چی دەکەن لێرە؟ دووبارە بۆ کاری خێرە؟ دوو دڵ بووم لەنێوان وتن و نەوتنیدا...دواتر بینیم لەوتنی ڕاستیەکە زیاتر قسەیەکی ترم نیە، بۆیە وتم:

– بانگ خوێندنەکەتان زۆر کاری تێکردم. ماشاء الله زۆر بە ئیخلاصەوە دەیخوێنن یەکسەر کار لە مرۆڤ دەکات. بۆ ئەمەش ویستم پیرۆزباییتان لێ بکەم.

– أستغفر الله بەڕێزم...إن شاء الله ئەم خواستەتان دەچێتە حوکمی دوعاوەو بەو جۆرە دەبێ کە ئێوە وتتان.

– تایبەتمەندیەکی تر کە سەرنجی ڕاکێشام، چوونیەکیی دەنگتان بوو لەگەڵ دەنگی برایەکەم بەناوی مستەفا.

– نەکا مەبەستتان مستەفا عوسمان ئۆغلو بێت؟!

یەکسەر بەپەرۆشیەکی منالآنەوە وتم:

– نەکا ئێوەش ئەو بناسن...!

– بەڵێ زۆریش باش دەیناسم.

– ئەو یەکەمین ڕێ نیشاندەرم بووە لەم خزمەتەدا.

– تەماشای ئیشی خوا بکە.... ئێمەش کاتێك لە قوتابخانە پێکەوە قوتابی بووین، کاکە مستەفا دەستی منی گرت بۆ وانەکانی قورئان و ئیمان.

لەوێدا خەریك بووم دەبورامەوە لە پەرۆشیمدا... زامە سارێژنەبووەکەی ناخم دووبارە کولایەوە، دووبارە دەروونم پڕ بوو لە هەست لەپەلەیی وەرگرتنی وەڵامدا بووم، بەزوویی وتم:

– ئێستا لەکوێیە؟

– ماوەی ساڵێك دەبێت لەمۆسکۆیە، ئومێد دەبەخشێتە موسوڵمانەکانی ئەوێ و بۆ ناساندنی ئیسلام بە ڕووسیەکان ڕۆیشتووە. ئاشکرایە بەهۆی شارەزایی باشی لەزمانەکانی ئینگلیزی و ڕووسی دا، گەورەکان ئەوەیان بەگونجاو زانیوە لەوێ کاری خزمەتی پێ بدەن، هەڵبەت خۆیشی زۆر لەخەمی ڕزگارکردنی گەنجە ڕووسیەکاندا بوو کە لە بۆشایی و کەم ئیمانیدا دەیان ناڵاند.

دەیویست ببێتە تیشکێکی ڕووناکی بۆیان هەروەها لەبەر ئەوەی باپیرەکانیشی لەوێوە هاتبوون ئەمیش هەستی بە قەرزاری وەفایەك دەکرد بۆ ئەوان.

کاکە مستەفا ژمارەکەی لای من هەیە ئەگەر بتانەوێت پێتان دەدەم.

وەك ئەوەی دەروونم بخوێنێتەوە....

منیش بەدەنگێکی وەکو پاڕانەوەوە پەرۆشی خۆمم دەرخست:

– زۆر مەمنونتان دەبم.

پارچە کاغەزێکی لەگیرفانی دەرهێنا، ژمارەکەی لەسەر نووسی و دایە دەستم. بەوەرگرتنی ئەو پارچە کاغەزە، بەزۆر خۆم ڕاگیرکردبوو تاکو نەکەومە سەر زەوی.

ئیتر هەموو دنیا هی من بوو، خودایە ئەو خۆشحاڵی و ئارامیەم وەسفی دەکرا!؟ ئیتر خەریك بووم باڵە فڕەم دەکرد بەرەو مستەفا کە لەسەرو هەورەکانەوە بوو، هیچ کەسیش نەیدەتوانی ڕام بگرێت...

## خودایە، یارمەتیم بدە دڵم نەوەستێت:

هەر لەدوای جیابوونەوەم لەگەڵ ئەو گەنجە خوێن گەرمە خاوەن ڕێزو بەئەدەبە، بەخێرایی دەستم دایە تەلەفۆنەکەم، نازانم چۆن ژمارەکانم وەرگرت..! بەبێ ئەوەی بزانم لەدوای وەڵامدانەوەی

تەلەفونەکەم من دەبێ چی بڵێم! بەبێ ئارامی چاوەڕێی ئەو دەنگە بووم بیبیستم..

ئەگەر وەڵامی بدایەتەوە لەدوای چەندین ساڵ دەنگیم دەبیست! لەو چەند خولەکەدا چی بەخەیاڵ و مێشکمدا نەهات!! دەبێت هاوسەرگیری کردبێت؟ ئەو پرسیارەم لەئیمامەکە نەکرد چەند جار هاتە سەر زمانم، بەڵام لەبەر ئەوەی هەڵە تێنەگات نەمپرسی...

بەزیاتر لێدانی دەنگی تەلەفونەکەو تێپەڕبوونی کات، پەرۆشی ئەوەندەی تر دایدەگرتم و زیاتر لەناو خۆمدا خۆم دەخواردەوە. خودایە! چۆن بەرگە بگرم یارمەتیم بدە هێزو توانام پێ ببەخشە.. بەحەسرەتێکەوە کە تاشە بەردی ئارامیم پارچە پارچە کرد بوو، چاوەڕێی وەڵامدانەوەبووم، کە بیستم وەڵامم دراوەتەوە بەپەرۆشیەکەوە وەك ئەوەی بەبایەخ ترین شتم دوای لەدەست دان، بەدەست هێنابێتەوە بۆ ئەوەی خۆم کۆنترۆڵ بکەم وتم:

– مستەفا..

وەڵامم لەدەنگێکی نامۆو ساردەوە بیست:

– ئێوە کێن؟

– من ئیلکای.

ترسام لەوەی ئەو دەنگە ساردە خەتەکە بپچڕێت بۆیە خێرا وتم:

– چی دەبێت.. دەپاڕێمەوە یەك خولەك گوێ بگرن زۆر شتی گرنگم هەیە کە بیڵێم تکا دەکەم... ئەگەر ئێستاش ناتوانن لەکاتێکی

گونجاوی تردا پەیوەندی دەگرم، لەبەر خاتری خوا گویم بۆ بگرن، چەندین ساڵە چاوەڕێی ئەم دەرفەتەم، ئەگەر کەمترین میهرەبانی دەنوێنن گوێم بۆ بگرن..دووبارە بەساردیەکەوە وتی:

- گوێم گرتووە.

- بوونە تیشکی ڕووناکی بۆ من، ڕێگەتان نیشان دام، تا بەردەرگای ژیانێکی نوێتان بردم، لەسایەی ئەمەشدا " ڕاستییەکانی ئیمان و قورئان" م ناسی. ڕوومکردە پەروەردگارم. هەوڵی ئەوە دەدەم هەموو ژیانم بکەمە وەقفی خزمەتی ئیمان. ئێستاش لەگەڵ دەیان قوتابی لەگەشتێکی چەنەکالیّ داین.

کەمێك دەنگی بەرەو نەرم بوون دەچوو:

- پیرۆزباییتان لێ دەکەم... ئەمانەم دەزانی. پەروەردگارم بەردەوامیتان پێ ببەخشێ، سەرکەوتوو بتان هێڵێتەوە.

- لەجیهانی من دا، ڕابەرو نوور پێشەوا تۆ بوویت... من باڵاو گۆشت و ئێسکی تۆم خۆشنەویست من ڕێزو گەورەیی و ڕۆحی تۆم خۆشویست، بەخەیاڵاتێکی گەنجانەی کچانەوە نەهاتووم عەشق تاقی بکەمەوە، من لەحەسرەتی قارەمانێکدام کە خوا خۆی پێی ناساندم و کردیە ڕابەرم.

ئەو خۆشەویستییەی بۆ تۆ هەمە هیچ پەیوەندییەکی بەچێژە دنیاییەکانەوە نییە، من شێتی عەشق نیم بەڵکو من لەبەر ڕەزامەندی خوا، بەکەسایەتی و پاکی و ئیمانی تۆ کاریگەر بووم، دەمەوێت لەژێر

سایەی تۆ ئەم دنیایە بەشەرەفەوە بەرەو حزووری خوا جێ بهێڵم. من دەمەوێت بەدرێژایی تەمەنم خزمەتی بەندەیەکی خۆشەویستی خوا بکەم، لەگەڵ ئەوەی هەموو ئەمانە دەزانیت، لەبەر چی بە پێداگریەوە لەمن ڕادەکەیت؟

خوا ئاگادارە، کە هیچ لەخەونەکانم و خەیاڵەکانم نەڕۆیشتوون، لەدوای هەموو نوێژێکم دەستەکانم بەرزکردۆتەوەو نزام بۆ تۆ کردووەو فرمێسکم ڕشتووە، بەبێ تۆ لەم ژیانەدا زۆر تەنهام، ئەگەر بەدەنگ منەوە نەیەیت، کەسە نیەت خراپەکانی دەوروبەرم دوورنییە لەدۆزەخی گوناهدا منیش بەند بکەن، چی دەبێت ڕەتی مەکەرەوە، ئەمە تەنها داواکاریمە، بەبێ ئەوەی خۆم ڕابگرم دەستم کردە گریان.

بەنەرم و نیانیەکەوە وتی:

– وادەزانی من ئەمانە نازانم ؟! وابیردەکەیتەوە تۆم بیرچۆتەوە؟

منیش هاوارم کرد:

– ئەی کەوایە بۆچی لەمن ڕادەکەیت؟

– من لەتۆ ڕاناکەم... من لەبەندایەتی ئەوانی تر و سەر داخستن بۆیان و گوێ ڕایەڵ بوون بۆ کەسانی یاخی لەخودا ڕادەکەم.

– هەموو شتێك گۆڕاوە..... چی دەبێت دەمەوێت بتبینم، زۆر شتم هەیە تێتبگەیەنم... ئیتر ڕامەکە لەدەستم چی دەبێت؟ دووبارە دڵم پڕ بووەوە لە گریان.

ئەویش وتی:

- ببورە من ئێستا ناتوانم قسەبکەم، پەیوەندیت پێوە دەکەمەوە.

خۆمم لەدەست دابوو:

وەك ئەوەی من نەبوو بێتم، نەمدەزانی ئەوەی لەو چەند خولەکەدا ڕوویدا چی بوو! ڕەنگە لەبەر ڕێزی ئەم گەنجە پاکانە بوو بێت کە خوای مەزن لە نارەحەتترین ڕۆژەکانمدا ڕووناکیەکی نیشاندام.

خەریك بووم لەخۆشحاڵیمدا وەکو باڵندە دەفڕیم، دنیام لەباوەش دەگرت کاتێك هاوڕێکانم هاتنەوە لام، من گەیشتبوومەوە بەوکەسەی چەندین ساڵ بوو لەحەسرەتی دوورییدا دەژیام، نەمدەزانی تا تەلەفۆنی دووەم دێت، چۆن دڵم بەرگە بگرێت چرکەکان بوو بوونە ساڵ و خولەکەکانیش سەدەیەك.

کەوتبوینەوە ڕێ و لە نزیك چەنەکالێ بووین چاوەکانم هیچیان نەدەبینی و گوێیەکانم هیچیان نەدەبیست، ئاگاداری هیچ شتێکی دەووروبەرم نەبووم، لەژیانمدا هیچ کاتێك ئەوەندە بە بایەخەوە چاوەڕێی بیستنی دەنگی تەلەفۆنەکەم نەبووم.

دەموت ئەگەر ئەمڕۆ ئەم تەلەفۆنە لێی نەدا ئەوا بەدڵنیاییەوە بەرگە ناگرم و خۆم دەگەیەنمە مۆسکۆ...بۆئەوەی ئەو قسە نیوەچڵەم تەواو بکەم...

بەڵام نەهات و نەهات.....

خـــەریك بـــوو دەمارەكـــانی مێشـــكم لەچـــاوەڕوانیدا دەپچـــڕان، لەپەرۆشیەكی تـەواودا تەلەفۆنەكـەم لەدەستم دانـە دەگرت بەتـەنها گوێم نا، بەڵكو بەچاوو هەموو ئەندامەكانی تریشم چاوەڕێی بیستنی دەنگی ئەو تەلەفونەمان دەكرد كە دەنگێكی لێوە نەدەهات...!

بەگەیشـتنمان بـۆ چـەنەكالێ قوتابیـەكان لـە شـوێنی خۆیـان جێگیركران، منیش لەژووره تایبەتیەكەی خۆم ئامادەكاریم بۆ نوێـژی عیشـا دەكـرد، هێـزم دایـە بـەرخۆم و ویسـتم بـەجوانترین شـێواز نوێژەكەم ئەنجام بدەم تاكو ئارام ببمەوە.

ئەو حەسرەتەی چـەندین ساڵە دەیچێژم یـەك لەسـەدی ئـەوەش نـەبوو كـە لـەو چـەند كاتـژمێرەدا تیـای ژیـام، لـەو كاتـەی وتم "دۆزیمەوە" ئەو وەكو خەیاڵێك فڕی و ڕۆیشت.

" چوومە سوجدەوەو لەناو كەشی مەعنـەوی نوێژەكەمـدا دەروونم بۆ خوا كردەوە، بەهەموو هەستەكانمەوە هانام بردو پاڕامەوە..

دەمزانی خوای گەورە( جل جلاله) چارەی بێ چـارەكانەو شـیفای دەردە دارەكانـــە.. بـــەر لـــەوەی دەســـتم دابگـــرم و بەهەســـتە هەڵقوڵاوەكانم و نزا گەرمەكانم و چاوە تەڕەكانمـەوە دوعاكـانم تـەواو بكەم، زەنگی تەلەفۆنەكەم لێی دا...

لەگەڵ بیستنی دەنگـی تەلەفونەكـە ئـامینم بـۆ نزاكـان كـردو بـەو حاڵەمـەوە خـۆم گەیانـدە تەلەفونەكـەم كـەدەنگی مسـتەفام بیسـت،

بەشـكور كردنێـك لەدڵـەوە سـیەكانم پـڕ كـرد لەهـەوا و هەناسـەیەكی قووڵم هەڵكێشا بەدەنگێك كە دەروونمی دەلەرزاند وتی:

– ئەو كاتەی پەیوەنـدیت كـرد سـەرقاڵی كۆبونەوەیـەك بـووم لەگـەڵ دۆستەكانم لەبەر ئەوە ناچار بووم لەنیوەدا بیپچڕێنم، داوای لێبـوردن دەكەم... ئێستاش فەرموون گوێتان لێ دەگرم ئیلكای خوشكم.. كـە بە "ئیلكای خوشكم" دەستی پێ كرد، ئامانجێكی ڕوونی هەبوو، بـەو مانایەی "من وەكو خوشكی خۆم دەتبینم، لەبەر ئەوە درێژەدان بـەم باسە مانایەكی نییە "...

چاوەڕێشی دەكـرد كـە منـیش بڵێم :" مـادام بـەم جۆرەیـە، ئـەم بابەتە لێرەدا تەواو دەكەین! "

بەڵام ئەمـە گونجـاو بـوو؟! ئـەو خۆشەویسـتییەی چـەندین سـاڵە وەكو ئاگر دەمسوتێنێ و خەیاڵ و خەونەكانم دەڕازێنێتەوەو لەیەكەم بینینەوە ژیانمی گۆڕی و منی بـۆ خزمـەت و دۆزینـەوەی پـەروەردگار پەلكێش كرد، دەكرێ پێی بڵێم "باشە باوابێت! ئـەم بابەتـە كۆتـایی پێ دێنین؟!" من بەردەوام بووم:

– مستەفا ... ئەمە دووبارە دەكەمەوە تكـا دەكـەم گـوێ بگـرن مـن پێویستم بە دەروونێكی گەرم كـراو بـە ئـارەزووە گەنجانـەكان نییـە. تەنها ئامانجم مانەوەیـە لەتەنیشـت تـۆو ژیانـە لـە پێنـاو ڕەزامەنـدی خوادا... تۆ دۆزینەوەی ڕێگاو بەدەسـتهێنانی ڕۆحێكـی سـاف و پـاك بەتەكنیك و فیكرەكانی، ئەوە بزانن كە مرۆڤ ئەو كارەی پێـی خۆشـە

دەیکات، هەنا بۆ ئەو کەسە دەبات کە خۆشیدەوێت، دەیەوێت لەو جێگەیە بێت کە پێی خۆشە... دەی تاکە حەسرەتی منیش ئەوەیە لەژێر نیکاحی تۆدا بەرەو گۆڕ بچم. بەم ئاسوودەیی و سوپاس گوزاریەوە بەرەو لای پەروەردگار بگەڕێمەوە.

بۆچی ئەمە بۆ من بە زۆر دەبینیت؟ بۆ هەمیشە ڕووت لێم دەردەگێڕیت؟ بۆچی ئەم داواکاریە پاکەم دەگەڕێنیتەوە؟

– ئیلکای خان " من هێشتاش باسی خۆمم نەکردووە، من ئامادەی چوونە ژێر باری قورسی هاوسەرگیری نیم، من دەستم بە بانگەوازەکەمەوە گرتووە، ئیتر هاوسەرگیریم پێ ڕاناگیرێت، ئەمە بەمانای نەویستن و خۆشنەویستنی تۆ نایەت، تکادەکەم تۆش لەمن تێبگە ئیتر...

دەمەوێت تەمەنێك خزمەت بکەم لەپێناو پەروەدگارم کە مرۆڤ بوونی پێ بەخشیوم، زۆر نیعمەتی بەسەرمەوە هەیەو تەندروستی ژیانی کردوەتە نسیبم، نیازی من هەر ئەوەیە کە شەوو ڕۆژم لەم خزمەتەدا تێپەڕێنم، نامەوێت هێزو توانای گەنجیم بە سەرقاڵی و کەوتنە ژێرباری بەرپرسیاریەتیەکانی خێزانەوە بەسەربەرم، چونکە ژیانم بەخشیوەتە ڕۆشن کردنەوەی ژیانی ئەو گەنجانەی لەچاوەڕوانی دەست گیرۆییەك و ڕابەرێکدان ئەگەر ٢٤ کاتژمێر خەریك بم هێشتاش کەمە. دەمەوێت هەموو کاتەکانم بەم عەشقە پڕ بکەمەوە...تۆش داواکاری هاوسەرگیریم لێ دەکەیت؟؟!

ئەگەر منیش بڵێم "بەڵێ" ئایا پێویست نیە بۆ دروست نەبوونی بەربەست لەبەردەم ئەم خزمەتەدا تۆ بڵێیت " نەخێر"..؟!

– کەواتە تۆ بڵێ... ڕێیەك بدۆزینەوە!.. من هەر ئەوەندەم بەسە لەژێر نیکاحی تۆدا مارەکرابم.. ئیتر نابمە باری سەرشانت هەر ئەوەندە بزانم من دیاری کراوی کێم!.. هەرگیز ناڕەحەتت ناکەم، تەنها بە هاوسەر بوونی تۆ گەورەترین شەرەفە بۆم تەنها جارجارە دەنگت ببیستم و دوعاکانتم پێ بگات ئەوەندەم بەسە.

قسەکانی پێ بڕیم:

– هەرگیز شتی وا قبوول ناکەم... مارەبڕین واتە بەرپرسیاریەتی. مارەکردن و دروست کردنی ماڵ و ژیان لەگەڵ کەسێك و دواتریش ژیان لەدوو دنیای جیاوازدا، ئەمە پێچەوانەی هاوسەرگیرییە هەرگیز ژیانێکی وا دروست ناکەم!

ئاه خوایە گیان! هەموو ڕێگەو هەموو ئەگەرەکان دانە دانە دادەخرێن و مستەفاش بەجۆرێك لەو سوتانەی ناخم تێناگات، بەمانایەکی تر ئەو ئاگادار نییە بەم وەڵامانەی چ سزایەکی ڕۆحیم دەدات. مستەفا کە ئیتر بەرگەی ئەوەندە پاڕانەوەو گریان و داواکانمی نەگرت، بەکردنەوەی دەروونی پڕ لە میهرو سۆزی خۆی کۆتایی بەم بێنەو بردەیە هێناو وتی:

– کەواتە دەتوانم پەیمانێکت پێ بدەم.

– چییە؟

– ئەگەر ڕۆژێک هاوسەرگیریم کرد، بزانن کە یەکەمین کەس لەدەرگای بدەم ئێوە دەبن، ئەگەریش هاوسەرگیریم نەکرد و کۆچم کرد بۆ ئاخیرەت ئەوا لەناو دەرگای گۆڕدا چاوەڕوانت دەبم.

ئیتر ئەمە بۆ من بەس بوو، ئەوەندە بەس بوو، ئەوەندە بەس بوو کە ئیتر وەکو خەیاڵێکی کچانەی گەنجانە لەسایەی ئەودا ژیانێکی ئەفسوناویم لەخەیاڵ دروست دەکرد، ئەگەر لەم دنیاش بەنسیب نەبوایە، لەئاخیرەتدا، کە زانیم ئیتر دەیەوێت کۆتایی بە قسەکانی بهێنێت، دوا ئومێد کە بەئەقڵمدا هات دووبارە هێزی قسەی پێدام:

– یەك خولەك ... کەواتە بۆ بەردەوامی ئەو ئومێدەم بۆ هەموو تەمەنم، با قسەکە ببڕینینەوە، هەر ئەوەندەی بزانرێت ئێمە بۆ یەك دانراوین بۆ من جێگەی هاوسەرگیری دەگرێتەوەو لە دوای ئەوەوە بۆ هەمیشە چاوەڕوانی تۆ دەبم.. ئەمەم ئەوەندە بەپێداگریەوە داواکرد، کاتێك وشەکانم ڕێکخست هەنسکەکانم تێکەڵیان دەبوون...

ئەویش وتی:

– باشە مادام گەورەترین ویستی تۆ لەم دنیا ئەمە بێت، بۆ ئەوەی ژیانت نەکەمە زیندان، با بەو جۆرەبێت کە تۆ دەڵێیت..

ئەمجارە ئیتر بەبێ ئەوەی خۆم کۆنترۆڵ بکەم:

– کەوایە من دێمە مۆسکۆ... ئەم ئیشە بەزوویی تەواو دەکەین ئەگەر نا من لەپەرۆشیدا دەمرم.

زۆر شڵەژا بووم، بەسەرسوڕمانەوە وتی:

- هەر وابەزوویی..؟

- بەڵێ... تەنانەت ئەگەر بکرێت هەر ئێستا..

- کەوا بێت، سەرەتا ڕەزامەندی خێزانەکەت وەربگرە ئەگەر نا من بەرگەی سەرزەنشتەکانی باوکت ناگرم.

- زۆر باشە هەر ئێستا...

فڕیم...فڕیم... لەناکاودا هەستم کرد گەردوونم لەباوەش گرتووە لەخۆشیەك دام کە دەگاتە سەروو هەورەکان بەئاسوودەییەکی زۆرەوە ئەو دنیا پڕ ناڕەحەتیەم جێ هێشت بوو، دەستم کرد بوو بەتەماشاکردنی هەسارەکان و ئەستێرەو کاکێشانەکان... خودایە ئەوە یەکەمین جار بوو لەو حاڵەدا بژیم...؟

هەستەکانم گۆڕا بوون بە گەردەلولێك کە دانەدەمرکایەوە. تا بگریامایە ئاسوودەترو تا فرمێسکم بڕشتایە زیاتر ئارام دەبوومەوەو تەنها داواکاریم لەخوا ئەوە بوو:

ببمە بەندەیەکی شیاوی خۆیی و هاوسەرێکی گونجاو بۆ مستەفا.

## داوەکانی مەرگ:

ئەو بەیانییەی کە خۆم بۆ فڕین بەرەو مۆسکۆ ئامادە دەکرد، ڕاوێژکارەکانم لەکۆمپانیاوە پەیوەندیان کرد، ئەو هەواڵانەی پێیان دام، دەستپێکی شەڕی مردن و ژیانیان نیشان دەدا، بەدواخستنی

ئیشەکەی مۆسکۆم بۆ چەند ڕۆژێکی تر بەخێرایی گەڕامەوە بۆ کۆمپانیا.

بەگەڕانەوەم بۆنی خوێن و مەرگم دەکرد بێ شەرمی ئەو باندو گرووپە بەدکارانە نە مرۆڤایەتی نەیاساو نەئینساف نەیدەگرتەوە، وەکو ئەمانە زاڵم و خیانەتکار بەرامبەر وڵات و نیشتیمانی خۆیان لە هیچ جێیەکی دنیا بوونی نییە. ئەنجامدانی هەموو ئەو کارە قێزەونانەشیان بەناوی نیشتمان و میللەتەوە، مرۆڤ شێت دەکات. ئەو کەسە ساویلکانەی بڕوایان پێ دەکردن یاخود ئەو کەسە خراپە خوازانەی پشتیوانیان دەکردن برینێکی پیسی سەر ئەم کۆمەڵگایە بوون، ئەو پەیامەی پێیان دام بەم جۆرە بوو:

- یان لەگەڵ ئێمە کاردەکەیت و جێگەی بۆشی باوکت پڕ دەکەیتەوە یان لەگەڵ کۆمپانیاکەت کۆتاییت پێ دێت و دەڕوێت کاتی زۆرت نەماوە، ئەمە دوایین ئاگادار کردنەوەیە:

کەسانێك کە بەسەر خوێنی خەڵکەوە سەڵتەنەت و بوونی خۆیان بەردەوامی پێ دەدەن، دڵنیام پەیوەندیەکیان بە مرۆڤ دۆستی و مرۆڤایەتییەوە نییە... درکم بەوە دەکرد.

ئیتر هەڵبژاردنەکە بەڕوونی لەپێشم بوو. یان بە گوێڕایەڵ بوون بۆ ئەوان سەرم بۆ هەزاران گوناهی تر دەکێشا، یان بۆ پارێزگاری کردن لەیەك ڕیزی و پاك مانەوەی خەڵك و هاوڵاتیانی نیشتمانەکەم مردنم لەبەرچاو دەگرت.

ئەو شەوە بۆ ئەو باسە لەگەڵ گەورەیەکی بەڕێزی کۆمپانیاکەم ڕاوێژم کرد، بەپێشنیارەکانی ئەو نەخشەڕێگەیەکم دیاری کرد، ئەوەش بەمانایەك دەهات کە دەبێت وەکو مرۆڤێکی کفن ئامادەکراو بژیم، ئەوەشم لەبەر چاو دەگرت بۆ وەستانی هەڵەکانی باوکم کە چەندین ساڵ بوو دابینکەری خەرجی ماددی ئەو قاچاخچی چەك و بازرگانی ماددەی هۆش بەرو ئەو کەسانە بوو کە ساڵانێکە بۆ بەدەست هێنانی دەسەڵات برا لەبرا جیادەکەنەوەو پێ لە ماف و حەقی خەڵك دەنێن و لەژێر چەتری دەوڵەتدا دەست بۆ هەموو کارێکی نایاسایی دەبەن، پلانێکم ئامادە کرد بوو..هەواڵم بۆ ناردن کەبێن و یەکتر ببینین زۆری پێ نەچوو پیاوەکانیان داباریین

" ئامادەکارییم بۆ قبوڵ کردنی هەموو داواکاریەکانیان نیشان داو، پێم گوتن کە لەمەودواش کاریان لەگەڵ دەکەم. ئەوانیش ئەم قایل بونەمیان قبوڵ کرد.

زۆر باش ئاگاداری پلانەکەی ناو خەیاڵیان بووم هەم خەرجی لەمن داوا دەکەن، هەمیش لەبەڕێوەبردنی کۆمپانیاکەدا کەسانی خۆیان دەهێنن و بەزۆر کردن لەمن لێرە دایان دەنێن بەم جۆرە کۆمپانیاکەم لەدەست دەردێنن و یاریەکە کۆتایی دێت، ئەو کۆمپانیایەی بە ڕووکەش من خاوەنداری دەکەم، لەڕاستیدا دەگۆڕا بەمۆڵگەو ئامێری پارە دروست کردن بۆ ئەو مرۆڤە پیس و چاو برسیانە.

دانە دانـە ئـەو مرۆڤـە دەروون تاریكانـەی چـەند سـاڵێك بـوو لـەم كۆمپانیایەوە پارەیان پێ دەگەیشت جێگیرم كردن پەیوەندیم لەگـەڵ زۆرینــەی گـەورە باوەڕپێكراوەكـانی ئـەو ئاژاوەگێڕانــەی وڵات و ئـەو خوێن ڕێژ و پیاوكوژانەدا بەست.

ئیتر كاتی بزوتنم هـاتبوو. بـەر لـەوەی ئـەو ئاژانسـانەی كـە دانـرا بوون وەكو سێبەر چاودێریم بكەن، بـەئاگا بـێن مـن دەبـوو كارەكـەم تەواو بكەم.

سەرەتا ناو و پەیوەندی و هەموو زانیاریەكی ئەو كەسـانەی لەبـەر دەسـتم بـوون دامـە پارێزەرەكـەم تـەنها بـەوەوە نەوەسـتام، بـەڵكو نموونەیەكم لەم بەڵگە نامەو زانیاریانە نـاردە سـەرۆكایەتی وەزیـران، سـەرۆكایەتی كۆمـار، سـەرۆكایەتی ئەنجومـەنی نیشـتمانی و هــەموو سەرۆكایەتیەكانی تر.

دواتریش بەو نرخەی كە لـەو كاتـەدا بەردەسـت بـوو كۆمپانیاكـەم فرۆشت و دایكیشم ناردە جێیەكی باوەڕ پێكـراو لـە ئیتالیـا.. خۆشـم كەوتمەڕێ بەرەو ئەو شوێنەی چەند ڕۆژێـك بـوو بەتاسـەوە چـاوەڕێی بووم، بەرەو مۆسكۆ.

# بەشی پێنجەم

## خودایە ژیانێکی لەم جۆرە!
## ڕۆح بەرگەی ئەمە دەگرێت!



### ڕۆحی گرفتار:

ئیتر من و دایکیشم ژیانمان لەمەترسیدا بوو، بچوومایەتە ناو کونی دەرزیەوە منیان دەدۆزیەوە، هیچ گومانم نەبوو کە تۆڵەدەکەنەوە، بەڵام بەپشت بەستن بەپەروەردگارم بەرامبەر ئەو مرۆڤە بچوکانەی دەیانەوێت ئەم نیشتمانە بکەنە دۆزەخ لەخەڵکی هەژار، بەرەو پێشەوە هەنگاوم دەنا. وەکو کەسێکی کفن ئامادەکراو لەهەر ساتێکدا ئامادەی مردن بووم. دڵنیا بووم ئەگەر ویستی خوای لەسەر نەبێت هیچ کەس ناتوانێت بچوکترین زیانم پێ بگەیەنێت، ئەگەر ئەو

ڕێگە بە مردنم بدات هەموو دنیاش بمپارێزێت کارێکیان لەدەست نایەت. وتەکەی دایکی فریشتە" خوا هەیە، خەم نییە" بووبووە گەورەترین پشتیوان و باوەڕی پتەو بۆم.

لەگەڵ بەیەکداچوونی ترس و ئومێد، خەم و خەیاڵ، ئاسوودەیی و بێ ئارامیەکانم، بەحاڵێکی پەرێشانەوە سواری فڕۆکەکە بووم، لەتەنیشت خانمێکی داپۆشراوەوە دانیشتم.

ئەو خانمە تابلێی موحتەشەم و ڕوو بەخەندە بوو، بەدرێژایی گەشتەکەمان گفتوگۆیەکی شیرین و خۆشی سازاند. ئەو خانمە لەبەر ئەوەی ئینگلیزی و ڕووسی زۆر باش دەزانی بۆ کارکردن دەچوو بۆ یەکێك لە قوتابخانە تورکیەکان لە ڕووسیا. دوای سێ مانگ لە هاوسەرگیری هاوسەرەکەی لەدەست دابوو سەرەڕای ئەو بارە قورسەی تیایدا ژیا بوو بۆ خزمەتی ئەو باوەڕە پتەوەی، کەوتبوەڕێ تاکو ڕۆحێکی نوێ بکاتەوە بەبەری قوتابیە ڕووسەکاندا.

لێم پرسی: ئەوە زۆر سەخت نەبوو بۆت؟

– هاوسەرەکەم کاتێك دەڕۆیشت بۆ یەکێك لەو قوتابخانانەی لە ئەفریقا دەکرایەوە، بەڕەحمەت چوو. لەو ڕۆژانەدا لە خەونمدا هاوسەرەکەمم بینی، بەچاوە پڕ حەسرەتیەکانیەوە ئەمەی پێوتم: " من تۆم زۆر خۆشویست، بڕۆ بۆ غەریبی، بۆ ئەوەی لە ئاخیرەتدا ئەم غەریبیە نەچێژین، تەمەنت لە خزمەت باوەڕدا بەسەر بەرە با غەریبیمان لە ئاخیرەت کۆتایی بێت"

که ئەم پەیامەم پێگەیشت لەو برایانە پاڕامەوە کە منیش بنێرنە جێگەیەك بۆ خزمەت کردن. من ژیانی خۆم بەم پەروەردەیە ببەخشم سا بەڵکو بەدوعای ئەو منداڵانە پەروەردگاریشم دەرگای بەهەشت بۆ ئێمە بکاتەوە. لەبەرامبەر بیرکردنەوەی ئەو خانمە گەنجەدا کە نووری عیففەت و پاکی و دروستی و وەفا لە ڕووخساریدا دەدرەوشایەوە، من بچوك دەبومەوەو خەریك بوو بەناخی زەویدا ڕۆدەچووم، مانای وایە ئەم جۆرە کەسانە، لەبەر ڕەزامەندی خواو خۆشەویستی قورئان و پەیامەکانی پێغەمبەرمانﷺ ئەوەندە فیداکاری دەکەن کە تەنانەت تەمەنی گەنجی و خۆشەویستی و عەشق و توانا ماددیەکانیشیان لەوپێناوەدا دەکەن قوربانی، ئەم مرۆڤە ئیمان و خاوەن باوەڕو بەوەفایانە لەپێناو نەبینینەوەی درامایەکی تر لە شێوەی ئەفغانستان و عێراق و فەلەستین بەتەنها لە ئەنادۆڵ نا، بەڵکو لەهەر جێگەیەکی دنیا کەدەستیان پێی بگات قوتابخانە دەکەنەوەو چالاکی ئەنجام دەدەن لە پێناو پێگەیاندنی نەوەیەکی ئیماندارو ڕەوشت پارێزراو... بۆ ئەمەش هەزاران گیان و ژیانی خۆیان دەخەنەلاوە.

یارمەتیدانی ئەم کاروانەو گرتنی جێیەك لەناویاندا، لانی کەم خۆش ویستنی ئەم دۆستانەو کارەکانیان شوکرو سوپاسگوزاری پەروەردگاری پێویستە کە بە ئێمەشی بەخشیووە.

لێم پرسی:

– خێزانەکەتان چی دەکات؟

– خێزانەکـەم مەسـیحین. هاوسـەری ڕەحمـەتیم بـووە هـۆی ئـەم ناسینەم بۆ ئیسلام و گرتنەبەری ئەم خزمەتەشم.

ئەم چیرۆکە زۆر پڕ پەند بوو. منیش بۆ ئـەوەی وانـەی باشـی لـێ وەربگرم پرسیاری زیاترم لێ دەکرد:

–ئەمە چۆن بوو ؟ خێزانەکەت بەئاسانی ڕێگەیان دایت؟

– بۆ ڕازی کردنی خێزانەکەم هەموو ڕێگەو شێوازێکم بەکارهێنا، بەڵام قایل نەبوون، منیش هاوسەرەکەم هەڵبژاردو جێم هێشتن.

– یەعنی ئەوە خۆشەویستیەك بوو کە دایك و باوکت بەجێ هێشت لـە پێناویدا؟

– لەبـەر بـەجێ هێشـتنی دایـك و بـاوکم نـەبوو، بـەڵکو لەبـەر جیانەبوونەوەم بوو لە جوانیەکانی ئیسلام کە ماڵم بەجێ هێشت.

ئەو خاتوونە گەنجە کە ناوی بـە کـوبرا گـۆڕی بـوو، لـەناکاو فرمێسـك لەچاوەکانی هاتنـە خـوار، بـەدڵێکی کـراوەوە لەباسـەکەی بـەردەوام بوو:

– هاوسـەرەکەم هەمیشـە زیـرەکترین قوتـابی بـووە، بەپلـەی یەکـەم بەشی یاسای تەواو کرد بـوو، هـیچ کـات تەماشـای کچـانی نـەدەکرد، ئەدەبەکەی بێ ئەندازە بوو. لـەکاتی قسەکردنیشـدا ڕووی وەردەگێـڕا یاخود سـەری دادەنەوانـد کـاتێ لـەهۆکاری ئـەم ڕەوشـتـەیم کۆڵیـەوە تێگەیشتم کە ئـەهلی ئیمـان و ئیسـلامە و گـەنجێکی دینـدارە، لەبـەر ئەوەی سەرسامی کەسایەتی خۆی بووم هەر بەو جۆرەش کەوتمە ژێر

کاریگەری باوەڕەکەیەوە، پەروەردگارم لوتفی کردوو هاوسەرەکەم بووە وەسیلەی ئیمان هێنان و ئاشنا بوونم بە هەموو جوانیەکانی ئیسلام، لەناخەوە شوکرانەبژێریەکی قووڵم کرد .

منیش وتم:

– ئەمە بەتەواوی چیرۆکی ئێمەیە، مانای وایە کەسەکانی ناو ئەم خزمەت و ئەم بانگەوازە سەرەتا بەتاقیکردنەوەی عیففەت و شەرمدا بە سەرکەوتوویی تێپەڕ دەبن و، دواتر بەرز دەبنەوە بۆ پلەی خۆشەویستەکانی پەروەردگار. بەدرێژایی ڕێگەکەمان بەرەو مۆسکۆ بەسەرهاتی ژیان و هاوسەرو عەشق و بانگەوازی کوبرا خان زۆر کاری تێکردم.

## سوپرایزێکی گەورە...

کاتێك لەفڕۆکەخانەکە دابەزین، بەماڵئاواییەکی گەرم لەو خانمە هاوڕێیەم جیابوینەوە. سواری تەکسیەك بووم و بەرەو ئەو ناونیشانەی پێم درا بوو بەڕێ کەوتم.

بۆ ئەوەی مستەفا پێی نەزانێت پێشتر لەڕۆژی چوونەکەم ئاگادارم نەکرد، لەبەر ئەوە وەکو داری بی دەلەرزیم و لەمێشکمدا پلانم بۆ یەکەمین ڕووبەڕووبوونەوەم دادەنا کە چی بکەم!

لەو ناونیشانەی پێم درابوو هاوەڵێك پێشوازی لێ کردم، ڕوخسارێکی کزو چاوەکانی شێدارو لە ڕوانینەکانیدا خەمێك

دەخوێنرایەوە، کە ئەو حاڵەیم بینی یەکسەر دڵم داخورپا، بۆ ئەوەی ڕوون کردنەوەیەك بدات، چاوەکانم لەچاوی بڕی ئەویش کە لە پەرێشانیم تیگەیشت وتی:

– ئێوە دەبێت ئیلکای خان بن!

بەترس و دوودڵیەکەوە وتم: بەڵێ.

– بۆنەیەکی نیشانەکردنمان بۆ ئێوە ئامادە کردبوو، بڕیاربوو کە ئێوە هاتن بەم بۆنەیە پێشوازیتان لێ بکرێ، واتە کاك مستەفا کە ئێوەی زۆر خۆشدەویست، سوپرایزێکی جوانی ئامادە کردبوو.

– ئێ ئێ ...ئەی چی بوو؟

سەری بۆ زەوی داخست و وتی:

– براکەمان، باوکمان، پارێزەرەکەمان، ڕابەرەکەمان لێ بزر بوو.

ئەم شۆکە دای لەمێشکم و حەپەسام ئەوەندەم توانی بڵێم:

– ئەمە واتە؟!

– مەترسن خراپ نییە، تەنها..

یەکسەر بێدەنگ بوو.. بەقووڵی لەچاوەکانیم ڕوانی، بەپاڕانەوەوە وتم:

– چی بووە بۆ خاتری خوا؟

– ئێمەش تێنەگەیشتین... چەندین ڕۆژ بوو لەچاوەڕوانی تۆدا ئامادەکاری دەکرد، دوێنێ ئێوارە لەبڕیارێکی کتوپڕدا بەرەو " مەدینە" فڕی، هۆکارەکەشی بۆمان ڕوون نەکردەوە، بەڵام ئەو

حاڵەی وەك بڵێی بۆنی مەرگی لێ دەهات. وادیار بوو ئەو چوونەی گەڕانەوەی بەدوادا نایەت! وەك ئەوەی نیشانەیەکی غەیبی پێگەیشتبێت، زۆر بەپەلە بوو.

ئەو هەواڵە کتوپڕەی وەکو ژەهرێکی سڕکەر دای لەدەروونم، هێزی پێ نەهێشتم، ڕووخاندمی وەکو بەفر توامەوە. هیچم نەدەبینی و نەدەبیست و هەست پێ نەدەکرد، تا دەهات ئەو هەستە بەسوێیە لەزەینمدا زیاتر پەنگی دەخواردەوەو هەناسەکانمی دەبڕی لەناکاو هەستم دەکرد هەموو شتێکی دەوروبەرم دەخولێتەوە، بەشێوەیەك شتەکان لەبەر چاوم دەخولانەوە. ئەو تاریکیەی چاومی داپۆشی بوو وای کرد کۆنترۆڵم لەدەست داو کەوتم، دوای ئەوەشم بەبیرنایەت. هەر کە هاتمەوە هۆش خۆم یەکسەر هەستامە سەرپێ. ئیتر یەك چرکەشم کات نەبوو بەفیڕۆی بدەم، ئەگەر لەدوا هەناسەشیدا بێت، دەبێت بگەمە لای و بەچاوی سەر بیبینم. بەو حەسرەتەوە کە دەروونمی ئاگر تێبەردا بوو، بەو ئازارەوە کەوتمەڕێ لەکوێوەو چۆن بوو نازانم! بەبێ بیرکردنەوە دوای چەند ڕۆژ خۆمم لە "مەدینە" بینیەوە.

هەر ئەوەندەی هەنگاوم نایە هەرێمی ئەو خۆشەویستی خۆشەویستانەﷺ و هەواکەیم هەڵمژی، بەبێ وەستان خۆم گەیاندە حزووری و کەوتمە سەر زەوی .

– ئازیزمﷺ من گوناهبارێکی ئوممەتەکەتم کە تۆی زۆر خۆشدەوێت، بەدوای بەندەیەکی خواو عاشقێکی تۆ بەناوی مستەفا دەگەڕێم،

تکادەکەم شەفاعەتمان بۆ بکە، بیرم نایەت هیچ کات لە ژیانمدا بەو ڕادەیە پاڕابێتمەوە و فرمێسکم ڕشت بێت، چەندە خۆش بوو مانەوە لە حزووری ئەو خۆشەویستەدا چەندەش بەئازار بوو بێ مستەفایی....!

لەگریان و پاڕانەوەکانمدا تەواو پەرێشان بوو بووم، نازانم چەندە کات تێپەڕی کە لە حزووری خۆشەویستی دڵانﷺ مامەوە، ئافرەتێکی پیر دەستی گرتم و یارمەتی دام هاتمەوە سەرخۆو هەستامە سەر پێ.

بەمێشکێکەوە کە وەك مەیدانی جەنگی لێهاتبوو، بەهەر جۆرێك بوو خۆم گەیاندە ئوتێلەکەم، نەمدەزانی لەکوێوە دەست پێ بکەم و چی بکەم و بچمە لای کێ بۆ پرسیار کردن ! تەنها شت کە دەمزانی کەمی کات و بەدڵنیاییەوە دۆزینەوەی مستەفا بوو.

## ئەی ئەگەر مردبێت؟!

ئەو شەوە تاکو نوێژی بەیانی لە دەرگای پەروەردگارم لە سوجدەدا پاڕامەوە:

- پەروەردگارم با لای مستەفا ئاشکرا بێت، گەڕانم لە دووی ئەو سوتانم بۆی، هاتنیشم بۆ ئێرە لەپێناو دۆزینەوەی ... ئەوم پێ بگەیەنەرەوە پەروەردگارم تاوەکو ئەم ئازارە بەسۆیەشم تەواو ببێت.

خودایە چی دەبێت، بەر لەمردن بەیەکمان بگەیەنە، لەلایەك بەئازاری

ئـەوەوەو لەلایـەکی تـریش لـەنێو ترسـی ئـەو نیـەت خراپانـەی دەورروبەرمدا مەمهێڵەرەوە.

خوایـە گیـان، بـا هـەموو ژیـانم بەشـانازی "مـن نیشـانکراوی مستەفا"وە بژیم .. خوایە گیان مەولام، ئەم داواکاریەی ئەم بەندە گوناهبارەت بەزۆر مەزانە. لەگەڵ بانگی بەیانی ئەو جێگە پـیرۆزەو دوای ئەنجامـدانی نوێـژی بـەیانیم لەسـەر بەرماڵەکـەم هەسـتام، بەئومێدێکی زۆرەوە بەرەو مزگەوتی پێغەمبەرﷺ بەڕێ کەوتمەوە.

لەنێوان کوڕەکاندا کەمێك چاوم گێڕا، بەڵام نیشانەیەك لەمستەفا نەبوو.. ! بەدڵمدا هات:

" خوانـەکات، خوانـەکات... دەبـێ چـی بەسـەرهاتبێت! "... بیرکردنەوەش لێی ئازاری دەدام، تاسەحەری بەرەبەیان سەرم نایەوە سەر زەوی،دڵم بەخشیە پـەروەردگارم و پاڕامـەوە، تـا ئـەو کاتـەش هەواڵێکم لێی نەبوو، بڕیارم دابوو بـەمردن و ژیـان بەرلـە دۆزینـەوەی لێرە ناڕۆم، مزگەوتم بەجێ هێشتوو ڕۆشتمە سەر مەزاری پیرۆزی ئەو هاوەڵە بەڕێزانەی تەمـەنیان لەخزمـەتی ئـەم بانگـەوازەو لەتەنیشتی پێغەمبـەری خـواﷺ بەسـەر بـرد، لای ئـەوانیش زۆر پاڕامـەوە... بەئەندازەیەك فرمێسك لەچاوەکانم دەهـات، ئەوەنـدە نزاکـانم بـەکوڵ بـوون کـە تەنانـەت ئـەو کەسـانەی دەورروبەریشـم ئاوڕیـان بەلامـدا دەدایەوە بەچـاوێکی بەزەیییـەوە تەماشـایان دەکـرد، نـازانم چـەندە بەئازاری دووری مستەفاوە گریام، نازانم چەندە پاڕامەوە لـە لای ئـەو

هاوەڵە مژدە پێدراوانەی بەهەشت کە خوا لێم خۆش بێت و باقی تەمەنم بۆ خزمەت کردن تەرخان بکەم، ئەوەشم بەبیر نایەت، لەوکاتەی خۆمم کۆکردەوەو نیەتی ڕۆشتنم هەبوو لای ئەو هاوەڵانە، لەناکاو لەدنیای مردوومدا ئەو دەنگە گیان بەخشە بیسترا:

– ئیلکای خان ....

بەهاوارێکەوە کە لە تەواوی دەروونمەوە هاتە دەر:

– مستەفا... تۆ لەکوێیت!

بەباڵایەکی چنراو بەپەرستش و سیمایەکی نورینی لێو بەخەندەوە کە بەقووڵی کاری لە مرۆڤ دەکرد، لەبەرامبەرمدا ڕاوەستا بوو تەماشای دەکردم، پەروەردگارم! ئێستا کاتی سوجدە بردنە... یەکسەر چوومە سوجدەو نازانم کە چەندە مامەوە بۆ سوپاسگوزاری... وەك ئەوەی پڕ بایەخترین مژدەی گەردوونم پێ درابێت، مستەفا دووبارە بەناو خوێن و دەمارەکانمدا گوزەری کردو هەموو شتێك لەلام تازە بووەوە، وەکو مرۆڤێك کە ئەقڵی لەدەست دابێت، خۆم دا بەسەر پێکانیدا ئەویش بەڕەوشت بەرزیەوە گەڕایە دواوەو وتی:

– ببورە ئیلکای خان....نابێت تۆ دەزانیت ئێمە هێشتا مارە نەکراوین...

من هۆشم لەدەست دابوو...هیچم نەدەبیست...! جگە لەو ئەوینەی لە ناخمدا جێگیر بوو بوو، هەستم بەهیچی تر نەدەکرد،

چـەندین کاتـژمێر هـەوڵی هێورکردنـەوەو هاتنـەوە سـەر خـۆی منـی دەدا،... بەترسێکەوە لێم پرسی:

– بۆچی لەناکاو هاتویت بۆ ئێرە؟

بەبیرکردنەوەیـەکی قووڵـەوە چـاوەکانی بڕیـە مزگەوتەکـەی پێغەمبەرﷺ وتی:

– ویستم خۆشەویستمانﷺ شاهیدی نیکاحەکەمان بێـت، ئەگـەر لـەم دنیـاش ئـەم هاوسـەرگیریە بەنسـیب نـەبێت، لەئاخیرەتـدا دیسـان سەرداری هەردوو دنیاﷺ شاهیدمان بێـت، بـۆ ئـەوەی زیاتر مـن لـەو پەرۆشیەدا نەهێڵێتەوە پرسی:

– تۆ چیرۆکی " حیفا خاتوون و صوهەیب" ت خوێندۆتەوە!؟

– بەڵێ، هەموو وشەکانیشم لەدڵمدا هەڵگرتووە.

– من ڕازیم ببمە صوهەیب.تۆش دەبیتە حیفام؟!

لەخۆشحاڵیمدا فڕیم.. بۆ بیستنی ئەم مژدەیە بەتـەنها گیانێـك نـا، ئامادەبووم هەزار گیان ببەخشم.

– ئەوەنـدە بەسـە مـن دڵنیـاببم کـە هـی تۆم...هـەموو فیداکاریـەك لەپێناو ئەم بەندە خۆشەویستەی خوادا دەکەم.

ئەوشـەوە بـە شـاهیدیی مەعنـەوی سـەروەرمانﷺ نیکاحەکـەمان بەئـەنجام گەیانـد، بـۆ ئـەو جێگـە بچـوکەی بۆمـان ئامـادە کرابـوو ڕۆیشتین.

لەجۆش و خرۆشی خۆم، دەست و پێم دەلەرزی، نەمدەزانی دەبێت چی بڵێم و چی بکەم..!

هەر بۆیە لە مستەفا پاڕامەوە:

– ئەمڕۆ بۆ من ڕۆژێکە لەو دیووی خەیاڵەکانەوە. تکا دەکەم مستەفا لەبەر هەر کەموکوڕیەکم بمبورە، بەو میهرو سۆزەیەوە کە بەهەشتێکی لە ئاسوودەیی لەناو دەروونی مرۆڤدا دەخولقاند قسەکەی پێ بڕیم:

– من بۆ گەڕان بەشوێن کەموکوڕیەکانی تۆدا هاوسەرگیریم نەکردووەو من بە فەرمانێکی مەعنەوی سەروەرمانﷺ هاتمە ئێرەو بەفەرمانێکی مەعنەوی ئەویش نیکاحەکەمانم ئەنجامدا. تۆ ئیتر ئەمانەتێکی مەعنەوی ئەویت لەلای من... من چۆن بۆ کەموکوڕیەکانی تۆ دەگەڕێم؟!

پەروەردگارم ! ئاه خودایە! ئیتر گیانم لێ بسەنەرەوە تاکو لەمەودوا گوناهو کەموکورتی ئەنجام نەدەم.. سەرم خستە سەر قۆڵەکانی و ئیتر ئەو کاتە کاتی گریان بوو، بەمە دەڵێن گریانی خۆشحاڵی، چەندین کاتژمێر لەخوا پاڕامەوە:

– خودایە شیاوم کە...شیاوی ئەم هاوسەرگیریە بم....خودایە ...پەروەردگارم دەپاڕێمەوە هەردووکمان بەبەندەی شایستەی خۆت قبوڵ کە....!

## لەیەکەمین شەوماندا، پەیمانم دا ببمە حیفا خاتوون

یەکەمین شەو کە ئەقڵی ون کرد لـە مێشـکمدا، خۆشـحاڵیی گـۆڕی بەسەرسوڕمان و خۆمی لەبیر بردمەوە...

مستەفا وتی:

- خوای مەزن کە ئەمڕۆی کردە نسیبمان، ئێمەش دەبێت وەکو حیفا خاتوون و صوهەیب بکەین، دەزانیت کە صوهەیب سـەرەڕای هـەژاری و بـێ کەسـییەکەی لەگـەڵ حیفـا خـاتوونی ناسـراو بـەجوانی و دەوڵەمەنـدی دا هاوسـەرگیری کـرد، قسـەکانی یەکـەمین شـەوی صوهەیب لەبیرناکەم.

لەناکاو مستەفا چاوەکانی پڕ بوون و لێوەکانی دەلەرزین.

صوهەیب وتبوی:

- ئـەی حیفا...دەزانیـت لەبەرامبـەر ئـەم نیعمەتانـەدا، مـن دەبێـت سوپاسگوزار بم و تۆش ئارامگر بیت، دەتـەوێت ئەمشـەو بەپەرسـتش بەسـەر بـەرین.. وەك پێغەمبـەرمانﷺ فەرموویـەتی: " لەبەهەشـتدا کۆشك و ساباتێك هەیـە، لـەوێ بەتـەنها سوپاسـگوزارو ئارامگرەکـان دادەنیشـن"، مسـتەفا لـەناو هەنسـکی گریانـدا ئەمانـەی دووبـارە دەکردەوە.

- هەرواشیان کردبوو... بەتەڕ کردنی بەرماڵەکەیان بە فرمێسکەکانی چـاویان، دڵەکانیشـیان بـەزیکر ڕۆشـن کردبـوەوە، جوبرەئیـل (علیـە

السلام) ئەوەی کە ڕوویدا بوو، بۆ حەزرەتیﷺ گێڕابـوەوە، هـەروەها مژدەی بەهەشتی لە خوای مەزنەوە بۆیان هێنا بوو.

صوهەیب کە ئەمەی بیست بوو، یەکسـەر چـوو بـووە سـوجدەوەو پاڕابووەوە لەخوا:

– پەروەردگارم ...تۆ کـە لـە مـن خـۆش بویـت، کەوایـە بـەر لـەوەی تێکەڵی گوناه ببمەوە گیانم لێ بسێنەوە. ئیمانی ناو ڕۆحـی ئەوەنـدە جۆشی خوار دبوو، کە مەولای گەورە ئەم داوایەی قبوڵ فەرموو بـوو، هەر لەناو سوجدەدا گیانی کێشا بوو.

حەزرەتﷺ هەواڵی پڕ پەندی ئەم چیرۆکەی کە چۆتە ناو مێـژووەوە، لـەدوای ئـەوە ئاشـکرا کردبـوو، لەوکاتـەدا حیفـا خـاتوونیش ڕۆحـی بەحەق سپارد بوو، مستەفاش کە فرمێسك وەکو باران لـە چـاوەکانی دەباری، زیاتر بەرگەی نـەگرت چـووە سـوجدەوە، ئەوەنـدەی تـوانی پاڕایەوە:

– ئەی پەروەردگارم !منیش بکە بەصوهەیب.

چاوە سووربوەوەکانی بەگریان، بەرەو لای من وەرگێڕا:

بێگومـان تـۆ نابیتـە حیفـا و منـیش نابمـە صـوهەیب، بـەڵام هـیچ نـەبێت دەبێـت لەسـەر ڕێگـەی ئـەوان ئـاواتی ئـەو ڕۆیشـتنە شەرەفمەندانەیە بخوازین.

## دوایین هەناسە لەسوجدەدا :

ئێمەش هەر وامانکرد.. هەردووکمان تا بەیانی نوێژی شکورو سوپاسگوزاریمان خوێند. تەسبیحاتمان کرد. دواتریش ڕۆیشتینە مزگەوتی پێغەمبەر و لەناو ئەو هەوا مەعنەویەی ئەوێدا لەنوێژی بەیانیدا ڕۆچووین.

لەدوای نوێژەکەمان، پەلەی ئەوەم بوو بگەڕێینەوە شوێنەکەی خۆمان و قسەی چەند ساڵ کە هەمبوو بۆ مستەفای بکەم، بەڵام ئەو بەجۆرێك هەر نەدەهات لەگەڵم.

نزیك بووینەوە لە نیوەڕۆ، مستەفا کە لەباسی عەشق و خۆشەویستی دنیادا صوهەیبی بە نموونە وەرگرتبوو زانیم کە لە حزووری پێغەمبەرداﷺ بەرشتنی فرمێسکی سوپاسگوزاریەوە ڕۆحی سپاردووە.

ئەم کارەساتە گەردوونی بەسەرمدا ڕووخاند، گیان و ڕۆحمی لەیەك جیاکردەوە وەکو خەنجەرێك لەدڵم درا، پەلە قاژەو تەقەلای ئاژەڵێك لەکاتی سەربڕیندا، ئازاری جیابوونەوەی ڕۆحی چۆنە، جیابوونەوەی منیش لەو ئەوینە هەمیشەییەم بەو جۆرە بوو.

بۆ ئەوەی منیش مەحروم نەبم لەو کەشە مەعنەویەی کە مستەفا تیایدا توایەوەو دوایین هەناسەی بەخشی، لە حەزرەتمانﷺ دەپاڕامەوە ببێتە شەفاعەتکارم، دەستم لە دەرگانەی پەروەردگارم

بەرزکردەوە، چەندین کاتژمێر سەرم لە سوجدە هەڵنەگرت. لەخوا پاڕامەوە ئەوەش بکاتە نسیبی من... لە کۆتاییدا لە هۆش چووم و بورامەوە....ئاه خۆزگە هەڵنەسامایەتەوە... ئەو ئیمانە لەکوێیە لەمندا! کۆتا هەناسە لەسوجدەدا هەروا ئاسانە؟!

شەرەفی گیان سپاردن لەسوجدەدا و لە حزووری حەزرەتداﷺ ئاخۆ بە چەپڵەو پارەو ناوبانگێک دەپێورێت؟! کامە دبلۆم و کامە پسپۆڕی پێی دەگات؟ ئەو خوای خۆی زۆر خۆشویست، پەروەردگاریش ڕۆحی ئەوی لەشیاوترین پێگەو جێگەدا بۆ لای خۆی بردەوەو بەرەو بەهەشت هەڵی فڕاند.

بەر لەوەی مستەفا دەستی بەردەستم بکەوێ، وەکو صوهەیب ڕۆیشت بەرەو مەنزڵی هەمیشەیی، بەڵام بەداخەوە نەبوومە حیفای شایستە بەو، تەنها دڵنەوایی من ئەوە بوو کە بووبووم بە مارەکراوو هاوسەری بەندەیەکی زۆر خۆشەویستی خوای مەزنم، ئەو ئەگەر خۆیشی بڕوات، ناو و ئەوینی لەلای من دەمێنێتەوە، کەسایەتی ئەو دەبووە گەورەترین شەرەفی من لەژیانمدا، ئیتر بەدرێژایی تەمەنم بەخەیاڵی گەیشتنەوە بەو لەئاخیرەتدا دەژیام، ڕۆژەکانم یان لەسەر مەزاری مستەفا یاخود لە مزگەوتەکەی حەزرەتداﷺ بەسەر دەبرد.

ئیتر بڕیارو پەیمانم بەخۆم دابوو کە دەبێت لەنێوان ئەو دوو دنیایەدا بمێنمەوە، ژیان و حاڵ و لانەی من لێرەبوو نەبەخەیاڵ و نەبەڕاستی بۆ چرکەیەك لەمستەفای نووری ژیانم جیانەدەبوومەوە،

بەڵام ئەو پەیامەی لەمستەفاوە هات، هەموو شتێکی سەرەو ژوور کرد.

ئەو ڕۆژە دیسان چوومەوە حزووری حەزرەتﷺ بەهەموو بوونمەوە دەپاڕامەوەو داوای شەفاعەتم دەکرد:

خۆشەویستی خۆشەویستەکانﷺ.. یەکێك لە ئومەتەکەی خۆت کە زۆری خۆشویستیت بەرەو لای تۆ بەڕێکرا، خۆت شەفاعەتی بۆ بکە تا لە سایەی ڕەحمەتی پەروەردگاردا بمێنێتەوە، من ئەوم زۆر خۆشویست، تۆش ئەوت خۆشبووێت، ئەو شەوە دیسان تا بەیانی لە مزگەوتی پێغەمبەر و لە حزووری حەزرەتداﷺ بۆ دوعاو پاڕانەوەکانم مامەوە، لەنزیکی بەیانیدا هەر لەسەر بەرماڵەکەم خەوەنوچکەیەك بردمیەوە.

خودایە، ئەوەی لەخەونمدا دەمبینی دووبارە باخچەیەك بوو لە بەهەشت، مستەفاو دایکی لەسەراو ساباتەکەیاندا دانیشتبوون. مستەفا پێی وتم:

- خەم مەخۆ.. ژیانی دنیا زۆر کورتە.. تۆ تەسلیمی خوا ببەو بۆ ئەو بژی، بیرت نەچێت ئەوەی پشت بەو ببەستێت دەیباتەوە، ئەوەی سەرپێچی بکات دۆڕاندویەتی...

خوای گەورەم، لەبەر ئەوەی تەمەنم کەمی مابوو، ڕێگەی بەهاوسەرگیریمان نەدا و، بێ ئەوەی چێژوو کەیفی دنیاییم پێ بچێژێت منی بردەوە لای خۆی و شیاوی چێژە بەهەشتیەکانی کردم،

بۆ چەشتنی لەزەتی ڕاستەقینەی هاوسەرگیری، من لێرە چاوەڕێت دەکەم، لەبیرت نەچێت کە ئەو کەسانەی لەدنیادا تەمەنیان بۆ خوا سەرف دەکەن و ناپەرژێنە سەر ڕێوڕەسمی ئاهەنگی هاوسەرگیریان. پێغەمبەری خواﷺ خۆی لە بەهەشت ئەو ئاهەنگەیان بۆ سازدەکات، ئەو لێرە خەڵات و دیاریمان پێشکەش دەکات. هەموو ئەهلی ئیمان و قورئان دەبنە میوانی بۆنەکەمان، بۆ بەدەست هێنانی ئەم نیعمەتە نەبڕاوەیە هەزار جاریش بمرین هێشتا کەمە، لەجێی هاوسەرگیریەکی فانی، هاوسەرگیریەکی باقی چاوەڕێمان دەکات...

تۆ بگەڕێوە نیشتمان و لەوێ بەردەوامی بەخزمەتەکانت بدە، ئەوێ دڵی جیهانی ئیسلامییە ئەو ڕۆژەی ئەو دڵە ڕزگاری دەبێت، دنیای ئیسلامی هەڵدەستێتەوە سەر پێ، ئەگەر ئەو دڵە تووشی نەخۆشیەك ببێت، دنیای ئیسلامی لاواز دەبێت، خزمەتی ڕاستەقینە لەوێیە لێرە دڵت بەتەنها لەبەر خۆت لێدەدات، بگەڕێرەوە ئەوێ و تەمەنت لەپێناو سەلامەتی ئیمانی هەزاران گەنج سەرف بکە. ئەوێ سەنگەری پاراستنی ئیمانە، ئەم کارەش لەتۆ دێت....

لەدەرگای گۆڕدا چاوەڕوانیت دەکەم...

## ئیتر نەخشە ڕێگام دیاری کرابوو:

بەنیازی بەدەست هێنانی ڕەزامەندی ئیلاهی، دەبوو شەوو ڕۆژ لە ڕێگەی خزمەتی ئەم قورئان و ئیمانەدا بژیم.. بۆ ئەوەی شیاوی سەرەتا پەروەردگارم پاشان مستەفا بم قورئان و سوننەتم کردبووە ڕابەر و بەرنامەی ژیانم.

ئەو مستەفایەی کە لەگیانی خۆم خۆشترم دەویست، سپاردم بە خۆشەویسترین زات و بۆ گەڕانەوەم بەرەو وڵات ئامادەکاریم کرد، دوایین جار کە چوومە سەر مەزارەکە لە چ حەسرەتێکدا ژیام تا مردن لەبیرم ناچێتەوە... لەوێ بۆ جارێکی ترو بۆ دوایین جار بەپاڕانەوەو ڕازی دڵ هەڵڕشتن دەرمانی ڕۆحمم کرد بۆ جارێکی تر لەسەر مەزارەکەی فرمێسکم ڕشت و لەخوا داوام کرد بەزووترین کات بەوم بگەیەنێتەوە.

کاتێک بیرم لەوە دەکردەوە بەئاسوودەییەوە بەرەو وڵات بگەڕێمەوەو دەست بکەم بەخزمەتەکانم، بەرلەوەی سواری فڕۆکەکەبیم، ئەو هەواڵەی پێم گەیشت دووبارە ڕووخاندمیەوە.

دایکم کە لە شارێکی ئیتاڵیا دوور لەچاوەکان لەلایەن چەند دۆستێکەوە دەپارێزرا، دەستی ناپاکەکانی پێ گەیشتووەو بۆتە قوربانی هەڵەکانی باوکم.

ئاه دایکە...!

من چاوەڕوانی ئەم هەواڵەم نەدەکرد...لەبەر ئەوەی زیانت پێ نەگات تۆم ناردە ئەو جێگەیە کە بەباوەڕ پێکراوم دەزانی بەڵام وا نەبوو...

ئەو خوێن مژانەی لەمرۆڤایەتیدا پشکێکیان نەبۆتە نسیب، بۆ ئەوەی هەڕەشەیەك بەمن بگەیەنن، سەرەتا بێ ڕەحمانە دەستیان گەیاندۆتە تۆ...

بەم هەواڵە چەندە خەفەتم خوارد. چەند گریام و ناڕەحەت بووم.. تاکە ئومێدو تاکە هاوڕازو هاوڕێشم لەدنیادا ماڵئاوایی لێکردم.

لەدەستدانی مستەفاو دایکم هەموو هێزو توانایەکی لێ سەندبوومەوە وەکو جەنازەیەکی زیندووم لێهاتبوو.

لەدوای ئەو کوشتنە دڕندانەیەی دایکم، دەمزانی کە نۆرەی من هاتووە... ئە مرۆڤ کوژە چاوبرسیانە دایکمیان لە ئیتاڵیا دۆزیبویەوەو لەپەنایەکداو دوور لەچاوی خەڵکی کوشتبوویان، دەمزانی بۆ گەیاندنی منیش بەهەمان سەرەنجامی دایکم، هەرگیز دەست هەڵناگرن، هەر بە دابەزینم لە فرۆکەکە پەیوەندیم بە دۆستە باوەڕپێکراوەکانمەوە کرد، لەبەرامبەر ئەو زانیاریانەی دەستم کەوتبوون، ڕۆژانێکی سەخت و بێئامان چاوەڕێم بوون لە ژیانمدا، چونکە کەسانێکی زۆر بەقیافەو ڕوخساری جۆراو جۆرەوە بۆ دۆزینەوەی من، جێگە نەمابوو سەری لێ نەدەن و، ناونیشان نەمابوو بۆی نەچن... ئیتر دەمزانی هەر کاتێك بێت و بەهەر فێڵێك بێت.

لــەپێناو تۆڵەســەندنەوەدا کەســانێکی چــەکدار دادەبارنــە ســەرم.
بەکورتیەکەی بۆ ڕووبەڕووبونەوەی بۆنەیەکی خوێناوی هــەموو شـتێك ئامادەبوو، ئەم بارودۆخە هەستیارە تەواو ناڕەحەتی کرد بووم و لـەو کاتەدا کە بـیرم دەکـردەوە چـی بکـەم و بچمە کوێ! لـەو ئۆتێلـەی تیایدا دەمامەوە تەلەفونم بۆ هاوڕێیـەکم کـرد، بـەڵام ئـەوەی لـەوەوە بیستم، بەجارێك ڕەنگی هەموو شتێکی گۆڕی.

فریشـتە و دایکـی زۆر ناڕەحــەتی مـن بـوون و هــەر بەگەڕانـەوەم داوای سەردانی کردنـی منیـان کـردووە، ئـەو دایـك و کچـە کـە وانـەی ژیانیـان بـەمن دا، لـەو کاتـەی لـە سـەختترین، بـاری ژیانمـدا بـووم پەیامــەکانیان منــی پاراســت و هێــزی پــێ بەخشـیم، وادیســان پــەروەردگارم وەکـو گـەورەترین پـارێزەر بـەرەو لای ئـەوان ڕەوانـەم دەکات.

لەو خانووە تازەیەدا کە بۆمـان ڕێکخسـت بـوون کاتێـك بەدیـداری ئەو دوو مرۆڤە ڕۆح پاکە شادبوومەوە، وەك بڵێی لەخۆشحاڵیدا هەموو شتێکم بیرچووەوە، بەبینینی ئەوان هەموو ئەندێشەو ئـازاری دەروونم سڕایەوەو چوومە دنیای پڕ لە ئاسوودەیی ئەوانەوە.

بەدڵسۆزییەوە و حەسرەتێکی گەرمەوە، وەکو دایکێکـی میهرەبـان ئەو خانمە لاوازە کە لەسەر جێگەکەی پاڵکـەوتبوو لەباوەشـی گـرتم و بۆنی پێوە دەکردم:

– بەقوربانت بم بەخێر هاتیت....چەندە لەخەمی تۆدا بووین، ئەی ئەو پاکیزەیی وناسکیەی لە فریشتەدا هەبوو! خودایە ئەوە لەکەسێکی تردا دەبینرێت؟!

ئەم دوو مرۆڤە هیچ لەبیری دەردە دنیاییەکاندا نین، وەکو مرۆڤە خەیاڵاویەکان لەهەست بەرزی و ئیمانی ئەمانە ڕاما بووم.. لەناو ئەمانەدا بم هیچ کەس ناتوانێت بمدۆزێتەوەو دەستی پێم بگات.

دایکی فریشتە وتی:

– خوشکەکەم مەترسە.. بە بێ ویستی خوای گەورە هیچ کەس زیانت پێ ناگەیەنێت، بەڵام ئەو کاتەی پەروەردگارم ویستی گیان کێشانی کەسێکی هەبوو، هەموو مرۆڤایەتی پێکەوە هەوڵ بدەن، ناتوانن ئەو سەرەنجامەت بگۆڕن، ناخی دەخوێندەوە، وەك بڵێی هەنگاو هەنگاو بەسەر هاتەکانم دەزانێت..

– ئیتر لێرە پارێزراویت... کوشتنی ئێمە، دەبێتە خۆکوژی خۆیان چونکە پەروەردگار بەندە بێ کەس و بێ پارێزەرەکانی بۆ کەس بەجێ ناهێڵێت، بەڵکو بەتایبەت خۆی پارێزگاریان دەکات.

کەمێك چاوەکانی گێڕاو دواتر ڕوانینەکانی هێنایەوە سەر من و لەناکاو دەستی کردە گریان..

– خوشکەکەم، دەزانیت زۆر ئێرەییم بەتۆ برد.

– أستغفر الله...من کێم کە ئێرەییم پێ بەرن؟ من تەنها بەندەیەکی گوناهبارم، هەر ئەوەندە.

– بۆ مستەفای برایشمان زۆر گریام، زۆر ناڕەحەت بووم، منیش دووعام دەکرد خوایە منیش لەسوجدەدا بگەڕێنەوە لای خۆت بەلام من لەکوێ وئەو ئیمانە لەکوێ؟

سەرلەنوێ برینەکانم کولانەوە، سەر لەنوێ ئاگری هەستەکانم بلێسەیان سەندەوە، ئەو هەر بەردەوام بوو لەقسەکانی:

– ئەو بەسەرهاتەی دایکیشت زۆر کاری تێکردم...

بەسەرسوڕمانەوە چاوم لەچاوەکانی ڕوانی و بەو مانایەی پەرۆشی ئەوەم بزانم ئەو چۆن ئاگاداری ئەو بارودۆخەی من و دایکم بووە!

چونکە باسی کوشتنەکەی دایکم هێشتا بەنهێنی مابووەوە، زانیاریەکی تەواوی باوەڕپێکراوم لە ڕووداوەکە پێنەگەیشتبوو.

– دایکت لەدوای مردنی باوکتەوە، باوەڕێکی هێنا بوو کە ئەگەر ئەو ئیمانەی دابەش بکرایە، بەشی سەدانی وەکو منی دەکرد. ئەوەندە بەم قسانەی پەرۆشی کرد بووم..! ئاخر ئەو هەموو ئەوانەی چۆن دەزانی؟! ئەو هەر بەردەوام بوو..

– ئەی نرخی ئەو دوایین ساتانەی...!

ئیتر من بەبێ ئەوەی هیچ پرسیارێك بکەم خۆم ڕاگرت، گوێم بۆ ئەو باسانە ڕاگرت کە ئەو ئاگاداریان بوو.

– ئەویش وەکو مستەفا، دوا هەناسەی لە سوجدەدا بەخشیوە. پیاو کوژەکان لە سوجدەدا دەستیان گەیاندوەتە ئەو و گیانی

سپاردووه، ئەو فیشەکەی داویانە لە لاشەی، پلەی ئەوی لە بەهەشتدا بەرز کردوەتەوە.

پەروەردگارم! ئەو بەندە زۆر خۆشەویستەی تۆ، چی دەوت؟ دڵی ئەو مرۆڤە ئازیزە چەندە کراوە بوو، ئەو کەساڵانێکە لە لێواری مەرگدا ماوەتەوەو جگە لەناوی خوا شتێکی تر نازانێت، بەڵام وەك بڵێی هەموو ڕووداوو پێشهاتەکان لە شاشەی دەروونەوە وەکو فیلم تەماشا دەکات.

لە مەدینەش لەناو مزگەوتەکەی پێغەمبەردا ﷺ چەندین جار خۆییم بینی بوو، بەڵام لەبەر ئەوەی دڵنیا بووم کەسێکە ناتوانێت هەستێتە سەر پێ، دەمووت لێرە چی دەکات! بۆیە وای بۆ چووم کە هاوشێوەیەکی ئەوەو گرنگیم پێ نەدا.

ئێستا لە هەموو شتێك باشتر تێدەگەیشتم، ئەم مرۆڤە لاشەی لەسەر جێگەکەی کەوتووە، بەڵام دڵ و ڕۆحی لەناو قووڵترین نهێنیەکانی گەردووندا دەسووڕێتەوە، لە ئیکرام و ئیحسانی زۆر تایبەتی پەروەردگارا ئامادەبوو.

چەندین جار لەخودا پاڕامەوە کە لەجیاتی ئەوەی تەمەنم بەتەندروستییەکی باش و دەوڵەمەندی و خەیاڵ بڵاویەوە بەسەربەرم، لەتەنیشت ئەم خانمەو لەگەڵ ئەم دوو مرۆڤەدا کە جگە لەخوا کەسێکی تریان نییە، منیش بژیامایە...

ئێستا لەژێر چاودێری مەعنەوی ئەم دوو مرۆڤە فریشتە ئاسایەدا ڕۆژەکانی ژیانم دەگوزەرێنم، مێشکیشم بەردەوام لەلای مستەفا وتەکانیەتی کە وەکو ئامۆژگاری بۆم بەجێ ماون...

– تۆ لەجێی خۆت بەئاسوودەیی بخەوە... بیرت بێت، کە من بەردەوام دەبم لە شەکاندنەوەی ئاڵاکەت، تەنانەت ئەوەندە هەوڵەکانم دەخەمەگەڕ، تا دەست بۆ ئەو خزمەتانەش دەبەم کە تۆ دەتویست ئەنجامیان بدەیت... ئاسوودەبەو چاوەڕێم کە... لەوادەی داهاتووماندا لەگەڵ قوتابیە دەروون پاکەکانم بەرنامەڕێژیەکی چڕو پڕمان هەیە، لەهەموو نوێژێکمدا دوعا بۆ بەردەوامی ئەم کارانەم دەکەم تا لەژیاندا دەبم... ئەگەر لەسەر سکاڵاو شکاتەکانیشم پرسیار دەکەن، منیش دەڵێم ئەوانەی کە دەیانەوێت ئەم مەملەکەتە بشێوێنن و بیری گەنجەکان وەکو دنیای تاریك و پیسی خۆیان تێك بدەن، ئەوا دانە دانە سزای کارەکانیان وەردەگرن، ئەگەر لەم دنیاش ڕزگاریان بێت، ئاخیرەت چاوەڕێیانە....

منیش لەهەر ساتێکدا چاوەڕێی میوانە پڕ ڕازەکەم کە دەرگام بکاتەوە.

وەرە... چی دەبێت وەرەو من بگەیەنە سەرەتا بەحەزرەتﷺ پاشان بە مستەفا...

وەرەو ئەوەندە لە چاوەڕوانیدا مەمهێڵەوە..

زۆر بیری ئەوان دەکەم، زۆریش ....

# پێڕست

# SECDEDE SON NEFES

## HALİT ERTUĞRUL

**بەڕێز مامۆستا خالید ئێرتوغروڵ**

من لە کەشێکی دوور لە بنەما ئایینیەکان گەورە بووم..

لە پێشانگایەکی کتێبدا، پەرتوکێکتان بە ناوی (دواین هەناسە لە سوجدەدا) سەرنجی ڕاکێشام، لە دڵی خۆمدا وتم "باسەیرێکی بکەم" بۆئەوەی بزانم چی لەخۆگرتووە، گرتم بەدەستمەوە، بەڵام ئیدی نەمتوانی دەست بەرداری ببم..

عەشقێکی پاك وبێگەرد..

حەسرەتێکی ئەفسانەیی..

تەمەنێکی لە سوجدەدا دواهاتوو..

بە سەرسامیەوە وتم: "شتی وانابێت "

ئەو شەوە: لە نێوان لاپەڕەکاندا و لە ناو لافاوی هەستمدا نوقم بووم ، نەمدەتوانی ڕێ لە فرمێسکەکانم بگرم.

ئەو شەوە: لەگەڵ حەقیقەتی بوونمدا ڕوو بەڕوو بوومەوە، بەندایەتی خۆمم بیرهاتەوە.

ئەو شەوە: هەستم بەو ئاسودەییە لەباس نەهاتووەی سوجدە کرد.

ئەو شەوە: بە پەروەردگارم گەیشتم. چونکە ئەو شەوە بەبیرتان هێنامەوە کێم..

لەگەڵ ڕێزو سوپاسی بێپایانم

خوێنەرێکی بەهەستی کتێبەکانتان

ISBN 0-0100-0000-3

9 780010 000009

نرخی (٣٥٠٠) دیناره




ناوەندی ڕاگەیاندنی ئارا

ARA Media Center

ara.m@hotmail.com